# خوێندن یان شووکردن

# کامە باشترە

# بۆ کچانی ئەم ڕۆژگارە؟!




نوسینی:

عبداللە خاکی



2021




خوێندن یان شووکردن کامە باشترە بۆ کچانی ئەم ڕۆژگارە؟

بسم الله الرحمن الرحيم

## ناسنامەی کتێب


**ناوی پەرتووک: خوێندن یان شووکردن کامە باشترە بۆ کچانی ئەم ڕۆژگارە؟**

**نووسین: عبداللّٰە خاکی**

**نـەخـشەسازیی ناوەوە: عبداللّٰە خاکی**

**نـەخـشەسازیی بەرگ: ڕێدار عومەر**

**نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم، ١٤٤٣ کۆچی – ٢٠٢١ میلادی**

**لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە « »ی**

**ساڵی «٢٠٢١»ی پێ دراوە**

## پێشەکی

سەرەتا ئامانج لە نووسینی ئەم بابەتە، تەنها ڕەزامەندی اللَّه تعالی یە و هیچی تر، پاشان ئاواتمانە موسوڵمانان لەو پەری خۆشی و ئاسوودەی بژین، وە ئەم بابەتە تایبەتە و پێشکەشە بەو کچە ژیر و ئاقلانەی کە هەرچی اللَّه تعالی پاشان پێغەمبەر ﷺ فەرموو بوویان تەسلیم و ملکچەی ئەبن، ئەوجا هەرچی فەرمان و یاسا هەیە ئەبێ بێ کەم و زیاد و گوێداری ئەبن و جێبەجێ ئەکەین وەکو خۆی، چونکە ئەمە سیفاتی موسڵمانی ڕاستەقینە، ئیماندارى ڕاستگۆ کاتێ پێیان گوت اللَّه تعالی پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ وا دەفەرمووێت یەکسەر ئەڵێت چی کاک عبد اللَّه یانی اللَّه تعالی پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ وای فەرمووە؟ بەڵێ وای فەرمووە یەکسەر دڵی ڕائەچەلکی ئەڵێت تەواو بیستم و گوێرایەڵ بووم، هەروەکو اللَّه تعالی ئەفەرمووێت: **(إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَأُولَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ)**[١] واتە: کاتێ بانگی بڕوادارەکان دەکرێن بۆلای فەرمانی اللَّه تعالی پاشان پێغەمبەرەکەی ﷺ بۆ ئەوەی لەنێوانیاندا داوەری بکا هەر ئەمەیە کە ئەڵێن: ئەوا بیستمان و گوێرایەڵیشین، ئائەوانە - کە بۆ ڕەزامەندی اللَّه پەلە ئەکەن- سەرفرازی ڕاستەقینەی دونیاو قیامەتن.

---

[١] - النور٥١

بەڵێ ئەگەر ئەو جۆرە ئیماندارە ڕاستەقینەیە نەبن دڵنیام ئـەم ئامۆژگارییـەی نووسیومانە قبول ناکەن، بۆیە ئەڵێم خوێندن تەنها لە کاتێك ڕێگە پێدراوە بۆ کچ کە ئیسلام حوکمی کۆمەڵگا بکات، و ڕێکـار و یاسـای زانکـۆ بـە پێـی سیستەمی ئیسلام بێـت، کەوابوو ئێستا ئیسلام حـوکم ناکـات و سـەردەمی ئاشوبە و فیتنەیە ئایە چ ڕێگایەک باشە بۆ کچانی ئەم سەردەمە.

ئەبێ ئەو ڕاستیەش بزانین کە ئافرەت یەکەم چەکی کوفرە بۆ بەکارهێنانیان دژی فیکر و هزری پیاوان و دەست بەسـەر داگرتنـی جیهـان و تـەواوی ئوممەتی ئیسلام.

فەرموون با بەیەکەوە ئەم نامیلکەیە بخوێنینەوە تاکو چەند راستیەك بزانین..

داواکارم لە اللَّە ئەم ماندووبوونەی چێشتوومانە لە نووسینی ئەم نامیلکە و تەواوی کردەوەکانمان لێ قەبووڵ بکات، کە تەنیا بۆ ڕەزامەندی خۆی بێت، هیچ ماندووبوون و کارێکمان بۆ جگە لەو نەبێت، و بەردەوامیمان پێ ببەخشێ لەسەر رێبازی پیرۆزی تەوحید.

**اللَّهُمْ اجْعَلْ عَمَلِي كُلَّهُ صَالِحَاً وَاجْعَلْهُ لِوَجْهِك خَالِصَاً وَلا تَجْعَلْ لِأَحَدٍ فِيهِ شَيْئَاً**

عبداللَّە خاکی.

٢٠٢١/١٠/١٣

چوار شەم

## خوێندن یان شووكردن كامه باشتره بۆ كچانی ئەم ڕۆژگاره؟

سەرەتا پێش هەموو شتێک ئەم سەردەمەی تێداین پڕیەتی لەفیتنه و کێشه و ناخۆشی و بەکورتی سەردەم ڕۆژگاری فیتنەیە، بۆیه دەبێ موسڵمانان وووریا و به ئاگابن تاکو نەکەونه ژێر شاڵاوی فیتنه و لەناو چوون، یانی چەند بڕژین و ڕۆژگار بڕوات ژیان ناخۆشتر دەبێ، بەهۆی دوورکەوتنەوەمان له ئیسلام، هەروەک بەچاوی سەر ئەیبینین، ڕۆژ دوای ڕۆژ ناخۆشی و فیتنه و ئاژاوەکان ڕوو له زیادبوون دەکات، هەروەک پێغەمبەری ئازیزمان ﷺ فەرموویەتی: **(لا يأتي عليْكم زَمَانٌ إلَّا والَّذي بعدَه شَرٌّ مِنْه حتَّى تلْقَوا ربَّكُم)**[1] واته: هیچ زەمانێک نایەت ئیلا ئەوەی دوای خۆی خراپتر دەبێت لەو (ئەمڕۆ خۆزگه به دوێنێ) هەتاکو دەگەڕێنەوە لای اللّه ی خۆتان.

بێگومان ڕاستی فەرمووه ئازیزمان بەهۆی تێپەڕبوونی کات زیاتر ناخۆشی و قەیران ئاژاوه ئەبینین، ساڵی پار کۆرۆنا بوو، هەموو خەڵکیان زیندان کرد لەکونجی ژوور، ئەم ساڵ جۆری تری کۆرۆنا دەڵێن به دیار کەوتووە، سەرەڕای دژایەتی ئەهلی کوفر بۆ موسڵمانان.

---

[1] - رَواه البُخاري

سەرەتا مەسروفات و بەخێوکردنی ئافرەت هەموو لەسەر پیاوە کە ئیش بکات و پارە پەیدا بکات و ماڵ و منداڵی بەڕێوە ببات، بە هیچ شێوەیەك دروست نیە ئافرەت کاری دەرەوە بکات و هاوشانی پیاو ئیش بکات، لە ئیسلام ڕێز و نرخێکی تایبەت دانراوە بۆ ئافرەت و وەکو شاژن مامەڵەی لەگەڵ بکرێ و ڕێز و گرنگی پێبدرێت، ئینجا خوێندن ئێستا هەموو بۆتە فشە و ڕابواردن و هیچ زانستێك فێر نابن، هەموو بە واستەو واستەکاری دەرئەچن، هەموو قۆپیە و غەش و فێل دەکەن، بڕوانامە و شهادە مسقاڵێک سوودی نەک بۆ کچ بۆ کوڕیش نیە و دانامەزرێن و دواڕۆژیان دیارنیە، و هیچ ئیش و کاسبیان دەست ناکەوێت، ئەبێ تەواوی تەمەنیان بەناچاری لە ئیش و کاسبی قورس و گران لەسەر جادە و مەیدانی کاسبکاران ببەنە سەر تووشی نەخۆشی فەقەرات و پشت ئێشە ببنەوە، نەک دامەزراندن و بوونە موەزفی ئەو وەزیفەی کە شهادەی لێ بەدەست هێناوە.

ئینجا زانکۆ لە ئێستادا بۆتە شوێنی عاشقاتی و ڕابواردن و گاڵتەکردن بە شەرەف و ناموسی کچان، خۆم لە بەشی کۆمپیۆتەر بووم کچ و کوڕەکان (دوور لە ڕووتان) ئەوەنە سووک بوون کوڕ و کچێکیان ئەکردە بوک و زاوا، و یاری دەست لە یەکدان و ئاو بەیەک داکردن و نزیک بوونەوە لە یەک، هەتا مامۆستاکانی زانکۆ و پەیانگا گێچەڵەی سیکسی بە قوتابیە کچەکانیان ئەکەن.

هاوڕێیەك بۆی گێڕامەوە، گوتی خوێندکاری کچ هەبوو نەی ئەزانی ناوی فەیسبوکی بگۆڕێت، بە هاوڕێکی منی گوتبوو بۆم بگۆڕە، گوتی ناوی بۆ گۆڕی بوو، ئەو کچە ئەوەندە نەزان و ساویلکە بوو بیری نەئەکردەوە سەیری چاتەکانی ئەکەم کە چۆن لەگەڵ مامۆستای زانکۆ کە پیاوە تا نیوەی شەو خەریکی تێرکردنی نەفسیان دەبوون بەقسەی نێوان ژن و مێرد و شەیتانی لە کاتێکدا مامۆستا خاوەن ژن و منداڵی خۆی بوو، مامۆستاکە لە چات ئەیگوتە کچەکە ئەمڕۆ بۆ ئەوەندە بۆنت خۆش بوو بۆن، واتە ڕۆژانە پیاسەیان ئەکرد، شەوەکەشیان گەرم ئەکرد بەقسە.

بۆیە چوونی کچان بۆ دەوام پاروویەکی چەورە بۆ هەندێ لە مامۆستا گورگ ئاساکان، بۆیە باشترین شت بۆ کچ مانەوەیانە لە ماڵەوە بۆ ئەوەی دووربن لە تاوان و ڕەشەبا و شاڵاوی فیتنەو بەهیلاک چوونی دونیاو دوارۆژ.

اللَّه تعالى داوا لە ئافرەتان ئەکات لە ماڵەوە بمێنەوە و دەفەرموێت: **(وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ)**[١] واتە: جێگیربن، بمێننەوە لە ماڵەکانت ئەی ئافرەتان.

بەڵێ مانەوە لە ماڵەوە لەم سەردەمەی پڕ لە فیتنەیە چاکترین کارە بۆ ئافرەت، گەر بۆ زەروریەت نەبێ و بۆ پێویستی و چوونە دکتۆر پێویست بکات، ئەوەتا هاوەڵی ئازیز عبداللَّه کوڕی مسعود (رضي اللَّه عنه)

---

[١] - سورەتی الاحزاب ٣٣.

دەفەرموویت: ئافرەت هیچ عیبادەتێکی نەکردوە، بە وێنەی لە اللَّه ترسان و دانیشتن لەماڵەکەیدا.

**(ما تعبّدتِ اللهَ امرأةٌ بمثل تقوى اللَّه، وجلوسها في بيتها)**[١]

ئەی خوشکی موسڵمانی موەحید بە تەنها بە دانیشتن لە ماڵەکەتدا باشترین عیبادەت ئەنجام دەدەیت، ئەمە فەزڵێکە بەس دراوە بە ئێوە بە فێڵی شەیتان لە کیس خۆتی مەدە.

سەیر بکە چۆن هاوەڵی ئازیز عبداللَّه کوڕی مسعود (رضي اللَّه عنه) کە یەکێکە لە هەرە کیباری سەحابە چۆن ترسان لە الله و دانیشتن لە ماڵەوە لەگەڵ یەک باس دەکات، بە دوو گەورەترین عیبادەت ناو دەبات بۆ ئافرەتان، بزانە، جاوەکانت بکەوە عەلمانی و کافرەکان چۆن بە هەموو شێوەیەک هانت دەدەن، کە بچیتە دەرەوە، شان بەشانی پیاوان کار بکەی، پێشبڕکێیان لەگەڵ بکەی، بزانە گەورەترین فێڵت لێکرا، تا ماوی ناتوانی ووتەیەک، ئامۆژگارییەک، ڕێنماییەک بدۆزییەوە لەوەی باشتر، جوانتر، چاکتر!

لەم سەردەمی فەسادییە چاکترین شوێن مانەوەیە لە ماڵەکەت.

بە هیچ شێوەیەک دروست نیە ١٦ ساڵ خوێندنێکی هیچ و هیچیش شارەزای ئیسلام نەبی، سەدان کچ هەن لە ماستەر و دکتۆرا ئەخوێنن و

---

[١] - بڕوانە: تفسير السمعاني

نازانن بنەماو بنچینەی ئیسلام چیە، گەر بەتەمای ئەوە بی لە خوێندنی زانکۆ فێری ئیسلام دەبی ئەوە تەنها فێل لە خۆکردنە، چۆن لە زانکۆی شەریعەیە فێری ئەو ئیسلامە حەقیقە نابی کە اللّٰە تعالی پێی ڕازییە، لە زانکۆ شەریعە لە ئاهەنگ و یەکترناسین ڕەشبەڵەک سەرچۆپی تێکەلاوی حەرام فێر دەکرێن.

بۆیە تەنها ئەوەندە فێربی بنووسی و بخوێنیتەوە گەورەترین سەرماییە بۆتۆ، قورئان و ئیسلام شارەزا ببی باشترین بڕوانامەی دونیایە، بۆیە کچی ژیر و ئاقڵ بە هیچ شێوەیەک تەمەنی خۆی لە خوێندنێکی هیچ و بەڵاشی دونیای بە فیرۆ نادات، چاکترین کار بۆ کچی ئەم ڕۆژگارە تەنها شووکردنە بە گەنجی سالیحە و چاکەکار و بەیەکەوە خۆیان شارەزای ئیسلام بکەن و پێش بڕکی قورئان و حەفزکردنی لەگەڵ یەکتر بکەن، وەکو لەسەرەوە ئاماژەمان بە ڕۆژگاری فیتنەکرد و ڕێگایەکیش لەوانە ئافرەتە، بۆیە دەبێ کچی موسڵمان خۆی بپارێزێ لەوەی ببێتە هۆی کردنەوەی دەرگای فەساد و تاوان، دەبێ بزانین کارکردنی ئافرەت لە دەرەوە ئەبێتە هۆی فەسادی و لە خشتە بردنی گەنجان، ئینجا تەنها بۆ پیاو فیتنە نیە بۆ گەنجانی هەرزەکاریش فیتنەن ئەم نموونەیە باس دەکەم تا ڕاستی بزانن کە ئافرەت لە شوێنی کارکردنی چۆن دەبێتە هۆی تاوان، لەبەر ئەوەی کچان باوەڕ و قەناعەتیان بۆ دروست بێت، ئەگەرنا ئامادە نەبووم ڕووداوێکی لەم جۆرە

باس بکەم، بەس بۆ ئەوەی قەناعەت بکەن کەچۆن ئـافرەت دەبێـتە فیتـنە، ئەم نموونەی باس دەکەم اللَّه تعالی ئاگادارە کە یەك ووشە درۆم نەکردووە و ئەو قوتابیانەی لەگەڵم بوون ئێستا ماون و شاهێدن.

بۆیە بەچاوی خۆم دەیان جار دیوومە و قوتابی بووم لە پـۆلی (٧ و ٨ و ٩) ناوەندی، کە ئەوکاتە قوتابییەکان گەر ساقیت بووبن تەمەنیان لە ١٣ سـاڵی ١٤ و ١٥ ۆ تاکو ١٧ ساڵی لێ بوو، لەم قوتابخانەیە شتی زۆر سـەیرم دی کە قوتابییەکان چیان بەرامـبەر مامۆسـتای ئـافرەت ئەکـرد، کـە گـێچەڵەی سیکسی یـان پێـدەکرا، مامۆسـتا لەکـاتی گـوتنەوەی وانە لـە ڕێـزی دواوە ئەوەستا قوتـابیەک ئەچـووە پشـتی ئەوەسـتا و جـوڵەو لەقـتەی نـاشرینی بەرامبەر ئەکرد!، هەموو قوتابییەکان سەیریان دەکرد و پێ ئەکەنـین، ئینجـا کە دەرس تەواو ئەبوو مامۆستا لە پۆل ئەچووە دەرەوە قوتابی تـر بـە دوای مامۆستا ئەکەوت دەستی بە زنجیری تەنـورە و لـەچکی مامۆسـتا ئەکـرد و ماچی لێ ئەدا، یان زۆر جـار مامۆسـتا ئاگـای لەخـۆی نەبـوو مەژغـووڵی سەیرکردنی واجبی قوتابییەکان بوو، زۆر جار قوتابی تر دەرزیان لێی ئەدا بە قەڵەم نوک، نوکەکەی دەرئەهێنـا وەکـو دەرزی پەنـجەی لەقەڵەم ئەدا و لە ڕانی مامۆستای نزیک دەکردەوە، ئەمـانە هەمـوو ڕاسـتی و حەقـیقەتن کە قوتابیەکان هێشتا نەببوونە ١٨ ساڵ ئەم هەڵسوکەوتە ناشرینەیـان بەرامـبەر مامۆستای ئافرەت ئەکرد، یـان مامۆسـتا لەسـەر ڕەحـڵە دائەنیشـت دواتـر

ئەڕۆیشت قوتابیەکـان ڕایـان دەکـرد دەسـتیان لە ڕەحـڵەکە ئەداو ماچیـان ئەکرد، چونکە مامۆستا لەسەر دانیشـتووە یـان بە زمـان شـوێنی دانیشـتنی مامۆستایان ئەلێساوە، بەم شێوەیە قوتابیەکان هیچ دەرسـیان نە ئەخوێنـد و بەردەوام ئەم کارە دووبارە ئەبوویەوە تەنهاش دەرسی ئافرەتەکان وابوو.

هەر بۆیە ڕۆژێک بڕیارمدا قسە بـۆ مامۆسـتایەکی سـفور بـکەم کە خۆیـان داپۆشن و دووربکەنەوە لەسەر پێچی فەرمانی اللَّە تعـالی، بـۆیە ڕۆژێـک ڕۆیشتمە سـەر ڕێگـای لەکـاتی چـوونەوەی بـۆ مـاڵەوە وەسـتاندم، گـوتم مامۆستا ئیزن هەیە دوو قسەت بۆ بکەم، گوتی فەرموو کاک عبداللَّە گـوتم بە خوا لەپێناو اللَّە قسەت بۆ دەکەم نە بۆ نمرەمە تاکو نمرەم پێ بدەی نەبـۆ ئەوەی ناجیحم بکەیت، هیچم لێت ناوێیت، ئینجا بە پوختی باسی مـردن و فەرزبوونی حیجابم بۆ کرد، گوتی زۆر مەمنـونم کـاک عبداللّـە ، هـاتمەوە ماڵ، ڕۆژی تر چوومە کتێبخانە نـامیلکەم بـۆ کـڕی باسـی ئامۆژگـاری بـۆ ئافرەتانی ئەم ڕۆژگارە و نامەیەکی دوور و درێژم بۆ نووسی لە بەندەی خوا بۆ مامۆستا و خوشکی بەڕێزم، زۆرشتم بۆ نووسی و باسی مردن و دواڕۆژ و کە بۆچی و لە پێناوچی ئەم قسـانەم بـۆ کـرووە، نـامەکەم لە لاپەڕی یەکەم داناو نامیلکەم کردە زەرفو کەپسـم کـرد چـوومە ئیـدارە بـانگم کـرد گـوتم فەرموو مامۆستا ئەم دیارییە پێشکەش بەتۆ بێت.

گوتی زۆر سپاس.

جا ڕۆژێک لەناو دەرسی کوردی بووم لەدەرگایان دا عبداللّە بێ مدیر ئیشی پێیە، ڕۆیشتم مدیر گوتی وەرە عبداللّە منی بردە ژووڕێکی بچووکی توێژەری کۆمەلایەتی بە تەنها هەردووکمان بووین گوتی چیت بەفلان مامۆستا گوتوە، وە چیت نووسی بۆی لەنامەکەدا.

گوتم بەخوا هەرچیم پێ گوتبێ لە چاکی و خەمخۆری خۆم بووە بۆی، باسی فەرمان بەچاکەو ڕێگری لەخراپەم کرد گوتم واجبە خەم لە ئیسلام بخۆین و خراپەمان بینی بیگۆرین بە چاکە، زۆر قسەم بۆ کرد کە لەپێناو اللّە پێم گوتووە و ئەخلاقی قوتابیەکان زۆر ناشرینە بەرامبەر مامۆستای ئافرەت، مامۆستاکە بە مدیری گوتبو کە بە عبداللّە بلێ وازم لێبینێت، گەرنا من لەو قوتابخانەیە دەڕۆم، سبحان اللّە ئەوە دڵسۆزی خۆمان بۆی ئەوها شکایەتم لێبکات لای مدیر، ئینجا مدیر گوتی کاک عبد للّە دەستت خۆش دەزانم تۆ ڕاستی و تۆ خێری خۆت کرد بەس وازی لێبێنە گوێدار نابێت، گوتم بەچاوان ئیلاقەم پێ نیە، مدیر زۆر ڕێزی گرتم، ئێستاش مدیر دوای دە ساڵ هەر دەمناسێتەوە زۆرجا لە بازار دەمبێنی دەلێ هاا گەنجۆ چۆنی.

مەبەستمان لەم باسە تەنها فیتنەی ئافرەتی دوور لە ئیسلامە ئەوجا ئافرەت لە هەر کوێ دەوام بکات، دڵنیام سەلامەت نابێ لە پیلانی شەیتان و مرۆڤەکان ئیلا فیتنەی لێ سەر هەڵئەدا.

چۆن ئەو ماوەی تر ئەو پیاوەی لە وەزارەتی دارایی ئەو کچەی کوشت کە شووی پێنەکردبوو، کابرا ئەڵێن عاشقی بووبوو.

بە کورتی ئیشی کچ و ئافرەت تەنها ماڵەوەیە و پەروەردەکردنی منداڵەکانیەتی، نەک خەمی ئیشکردنی بێت و ببێتە کێڵکەر و خزمەتکاری گشت خەڵکی، بەڵکو ئیسلام ڕێزی لە ئافرەت گرتوە هەروەک لەسەرەوە باسمانکرد، کە ببێتە شاژنی یەک پیاو، بۆیە تکایە کچانی لاوی تێگەیشتوو خەمتان کارو کاسبی نەبێ لە دوکان و شوێنە گشتیەکان، هەموو گێچڵە و تەعلیقتان لێبدەن و بێ ڕێزیتان پێ بکرێ.

بۆیە کچی ژیر بیر لەوە دەکاتەوە شوو بە کوڕی ديندار و سالیحە بکات و شەرەف و ناموسی خۆی بپارێزێ و نەوەیەکی قورئانی پەروەردە بکات بۆ خزمەتی ئومەتی ئیسلام، نەک چوونە دەر و بە سووک سەیرکردنیان، ئەو کچانەی کە دەڵێن دوو ساڵمان ماوە، ئەو هەموو ماندووبون و چەن ساڵەمان کردووە و بەڵاش بڕوات تا زانکۆ تەواو نەکەین شوو ناکەین، و دەمانەوێ لەبەشەکەی خۆمان خزمەت بکەین پێم وایە تەنها لووت بەرزی و خۆهەڵخەڵتاندن و فێل لەخۆکردنە، چیە وەڵا تا کارێک بکەین و مووچەیەکمان هەبێت بەڵام نازانن کە کاری ماڵەوەیان هەر لە کۆڵ نابێتەوە و دەبێ کاری دەرەوەش بکەن ماندووبونی دوو ئەوەندە دەچێژن، تەنها بێتاقەتیان بۆ دەمێنێتەوە، یان دەڵێن مووچەی خۆتت هەبێ تاکو مەجبوور

بە مێردت نەبی نازانن ئیتر پیاوەکەی وا مەسرەفی ماڵ هەر ناکـات دەبێـت خۆی دەوام بکات و شتی ماڵەوەش بکڕێـت، تێنـاگەن کە ژن و مێردایەتـی واتا پەیوەندیەکی توند و رازی بـوون بەوەنـدەی کە پیـاوەکەی هەیەتـی و بەخۆشـی دابەشـی بـکەن لە نێوانیـان تەنهـا هـانی دەدەن ئاگـاداری ئەو کەسانەش نین کە دەوام دەکەن کە چەند بێزارن منداڵەکانیان یـان لە مـاڵە داپیرە گەورە دەبێ یان لە داینگا، ئیتر منداڵێکی بێ سـۆز و پەروەردەیەکـی سقەتی لێ دەر ئەچێت.

تۆی ئـافرەت دەبـێ خۆشەویسـتی و گرینگـی پێـدان بـدەیت بە منـداڵ و هاوسەرەکەت نەك شەهادەیەک و دەوامێک کە هیچ کەڵک و سـوودی بـۆ بەختـەوەریتان نـیە یـان دەڵـێن بخـوێنە تـا کەس نەڵـێ خوێنـدنی تەواو نەکـردووە نەزان و جـاهیلە لە کاتێکـدا سـەرکەوتنی هاوسـەرگیری قەت پەیوەست نیە بەخوێندن و بڕوانامە، ئەزیزم جاهیلی بە بڕوانـامە نـیە دەیـان کەس دکتۆرا و پرۆفیسۆری هەیە بەڵام نازانێ قورئان چەن سوڕەتە ئەزیـزم جاهیلی ئەوەیە تۆ هیچ لە ئیسلامەکەت شارەزا نەبی، ئینجا گەر تـۆ ژیـر و ئاقڵ بی، ئەتوانی لە ماڵەوە خۆت فێری خەیـاتی و ئیشـی چنـین و دروون بکەیت، گەر شوو بە کوڕی ساڵیحە بـکەی ئەتوانیـت لە ئـۆنلاین پـێکەوە ئیشی دروستکردنی مەدالیاو ناو نووسینی دەزگیراندارەکان لەسەر مەدالیاو دروستکردنی تورشی و کولیچە و کێک و خواردنەکان بـکەن و پێـاوەکەت

بیگەینێتە کڕیارەکان و بەڕێزیشت لەماڵەوە خەریکی دروست کردنی بیت، بەڵام ئیشی گشتی و چوونە دەر بوونە کۆیلەی خاوەن کار و ئەمانە جائیزنین و زۆرجا چیرۆکی دەستدرێژی کەرانی خاوەن کار و مدیر و بەڕێوبەرەکان بۆ سەر کچان و ژنان ئەبیستین، بۆیە وازبێنن لەکاری دەرەوە و چوونە دەرو گەڕان بەبێ ئیشی.

بۆیە رسول اللَّه ﷺ ئامۆژگاری ئافرەتانی کردووە و بەمانەوەیان لە ماڵەوە و فەرموویەتی: **(المرأة عورة، فإذا خرجت استشرفها الشيطان، أقرب ما تكون من وجه ربها وهي في قعر بيتها)**[1] واتە؛ ئافرەت (دەنگو) هەموو لەشی عەورەتە، و ئەگەر لە ماڵ ڕۆشتە دەرەوە (یان کەوتە تێکەڵ بوون) شەیتانی لەگەڵ دایەو دەبێت بەهاوڕێی، وە باشترین جێگا لە اللَّه نزیکی بکاتەوە ناوەڕاستی ماڵەکەیەتی.

بە قوربانی ئامۆژگارییەکانی رسول اللَّه بم بەڕاستی ئافرەت گەورەترین فیتنە و تاقیکردنەوەیە بۆ سەر پیاو، گەورەترین فیتنەش لە دوای دەجال، ئافرەتە هەروەکو پێغەمبەری ئازیز ﷺ دەفەرمووێت: پاش خۆم لە نێو خەڵکیدا هیچ فیتنەیەکم جێ نەهێشتووە لە فیتنەی ژنان خراپتربێت بۆ سەر پیاوان.

[1] - ترمذي و ابن حبان.

**قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ (مَا تَرَكْتُ بَعْدِي فِتْنَةً هِيَ أَضَرُّ عَلَى الرِّجَالِ مِنَ النِّسَاءِ)**[١].

مەبەست خراپترین تێیاچون و فیتنە بەسەر پیاوان ئافرەتانن، چونکە ئافرەت سەرنج ڕاکێشە بۆ پیاو هەستی دەجولێنێ و وادەکات خۆی نەگرێت بەرامبەر ناز و مەکری و جوانی سەرنجام تووشی تاوان دەبێت هەر بۆیە کاتێك ژنەکەی پادشای میسر- مەکرو فێڵی بۆ یوسف (علیە السلام) بەکارهێنا بۆ لە خشتەبردنی یوسف (علیە السلام) و ڕاکێشانی بۆ داوێن پیسی، ئەگەر فەزڵ و بەخششی اللَّه تعالی نەبوایە یوسف (علیە السلام) ڕزگاری نەدەبوو لەو مەکرو فێڵە، بۆیە یوسف لە اللَّه تعالی پاڕایەوە ئەگەر نەی پارێزێ ئەوا تووشی تاوان ئەبێ و هەروەکو اللَّەی بەرز دەفەرمووێ: **(وَإِلَّا تَصْرِفْ عَنِّي كَيْدَهُنَّ)** یوسف گوتی خودایە ئەگەر تۆ فێڵ و حیلەی ئەوانەم لێ لانەدەیت بەمیهرەبانی خۆت **(أَصْبُ إِلَيْهِنَّ)** لەوانەیە دڵم مەیل و ئارەزوویان بکات **(وَأَكُن مِّنَ الْجَاهِلِينَ)**[٢]

و بچمە ڕیزی نەزان و نەفامەکانەوە، ئەگەر پێغەمبەری اللَّه ئاوا لەمەکرو فیتنەی ئافرەتان ترسابێت، مرۆڤی ئەم سەردەمەی ئێستامان چی کە

---

[١] - [بخاري ٤٨٠٨]

[٢] - (یوسف:٣٣)

بەهەموو شێوەیەک ئاسانکاری کراوە بۆ تاوان و فیتنە و تووشبوونمان بە خراپە ئەی خاکمان بەسەر!

بۆیە کوفر و ڕۆژئاوا بۆ ئەوەی حوکمی هەموو جیهان بکەن پیلان و فیتنەیان داڕێشت و خوتەیان دانا بۆ لەناو بردنی موسڵمان و ژێر دەستە کردنیان، یەکێک لەو ڕێگایەیی کوفر بۆ لە خشتەبردنی تاکی موسڵمان ئافرەتە، بۆیە هەستان بە ناردنی ژنی داوێن پیس و جلی نمیچە ڕووتی سەرنج ڕاکێش و جوانکاری و میکاج و ئەشیای ئافرەتان بۆ کۆمەڵگای موسڵمانان، بڵاوکردنەوەی فیلمی سیکسی و بێ ڕەوشتی و سووککردن و بەکاڵاکردنی ئافرەت و دانانی وێنەیان لەسەر بەرگی سابۆن و شامپۆ و تەواوی کاڵاکان بۆیە ئەم ڕێگایەی کوفر زۆر سەرکەوتوو و لێزان بوو، توانی بێ ڕەوشی و داوێن پیسی تەواوی کون و قوژبنەکان بگرێتەوە، بێ ڕەوشتی بڕواتە هەمووماڵەکان ڕێگایان ئاسانکرد، لە ناو ماڵ و بە موبایلەکەت ئافرەتی بێ ڕەوشتت نیشان بدەن، بۆیە موسڵمانان بەتەواوی دووکەوتونەوە لە ئیسلام، زۆرینەی تەنها بە ڕووکەش موسڵمانان گەرنا هیچ لە ئیسلامی حەقیقی شارەزا نین، و تەنها یەک دوو نوێژ و ڕۆژووە و تەواو، تۆ بەهەشتیت، ئینجا کوفر ئافرەتی لە ماڵ و دایکایەتی هێنایە دەرەوە و کردیان بە کاڵای ڕابواردن و تێرکردنی شەهوەتی پیاوان، بۆیە گەورەترین فیتنە ئافرەتی بێ ڕەوشت و دوور لە ئیسلامن، وەکو لەسەرەوە ئاماژەمان

پێدا لەسەرنج ڕاکێشی و هەڵخەڵتاندنی پیاوان، باشترین کار بۆ گەنجان لە ئێستا زوو هاوسەرگیری کردنە، تاکو دووربی لە فیتنە.

بۆیە کچان ئەی خوشکانی بەرێز ڕەحمەتتان لێبێت لەم ڕۆژگارەی پڕی فیتنەیە چیت داوە لە کێشە و سەر ئێشە، وەلا دەچیە بازاڕ گریانت بۆ حاڵی ئافرەت دێت، کە بەرگی شەرم و حەیایان لێ داماڵیوە، بەرگی ڕووت و جلی کافر و لەش فرۆشانیان کراوەتە بەر.

باشە بۆ ئافرەت مناڵی خۆی بەخێو بکات بێ بایەخەو ئەمە کار نیە بەڵام لە دایەنگە دەوام بکات ئیشی باشە!

ئایا ئافرەت کار دەکات پێویستی پێیەتی ئەی بۆ لە مارکێت و شوێنە خزمەتگوزاری و قەرەباڵغەکان ئافرەتی بە تەمەن یان داپۆشراو وەرناگرن؟!

دەبێ ئیلا کچی سەرنج ڕاکێش و جلی نمیچە ڕووتی لەبەر بێت، تا سەرنجی کڕیار ڕاکێشێ و بەردەوام پیاوان بچنە ئەم مارکێتە و فیتنە دروست بێت.

ئەگەر دەڵێن با ئافرەت بێتە دەرەوە بۆ ڕاپەڕاندنی ئیشوکاری ئافرەتان ئەی بۆ زۆربەی زۆری دوکانی فرۆشیاری جلی ژێرەوەی ئافرەتان پیاوە!

ئەی بۆ زۆربەی ئاراشتگای ئافرەتان پیاوی لێیە و جوانکاری بۆ ئافرەت دەکات!

لە سەدا نەوەدی ئافرەتان ئیش دەکەن بۆ ئەوە نیە پێویستی پێیەتی نا بەڵکو بۆ ئیسراف کردن و شتی زیـادەیەتی یـا خـانم بێتـاقەتەو دەڕواتە دەر جەو دەگۆڕێ یا...یا.... پەنا بە اللَّه تعالی.

لەگەڵ ڕێزم پیاوان (بـاوک، مێـرد، بـرا) غیرەتـی نەمـاوە شـانازی دەکـات ئافرەت دەڕواتە دەرەوە بۆ پارە پەیدا کـردن بەبـێ ئەوەی بیـر بکـاتەوە ئەو پارەیە حەرامە.

حەرام هەر دزی نیە، دەڵێن ڕەنجی شانی خـۆیەتی ئـاخر کـاتێ بـۆ پەیـدا کردنی پارە ئابڕووی کەوتە مەترسی و سوکایەتی پێ کراو شـەرم و شـکۆی نەما، ئەوکات پارەکە سوودی چیە!

ۆیە باشترین شت بۆتۆ شووکردنتە و نازهەڵگرتنتە لای پیاوە ساڵیحەکەت و بەڕێکردنی ڕۆژە ناخۆشەکانتانە بەیەکەوە، خۆتان شارەزای زانستی شەرعی بـکەن و قیـامەت و مـردن بیـری یەکـتر بـخەنەوە و پێشـبڕکێ بـکەن لە دڵخۆشکردنی یەکتر خەمت خوێندن و جوونە زانکۆی مەڵبەنـدی شـەیتان نەبێ دەیان بڕوانامەی بێسوود بەقوربـانی گریـانی منـداڵەکەت بـێ لەنیـوە شەو لە خەوی شـیرین ڕات ئەپەڕێنێـت، دڵنیـابە دەیـان بڕوانـامە نـاتوانن دڵخۆشت بکەن گەر بێبەشبی لە شووکردن بە پیاوی سالیح و چاکەکار.

بۆیە ژیرانە بۆخۆتان بژین دونیایەکی کاتی و کەم شایەنی ئەوەنیە تەواوی تەمەنت بە خەم و ئاخ و حەسرەت بەڕێ بکەیت، ژیانت لەگەڵ گەنجی ساڵیحە بە خواپەرستی و بۆ اللَّـه ژیانت تەواوی بڕوانامەکانی دونیا دەهێنێت.

بۆیە خۆت یەکلایی بکەوە، تۆ داخوازی کار و پیشە و هەلی کار و دونیای، یان داخوازی بەهەشتەکانی!



## بڕوانامەی زانکۆ نابێتە هۆی بەختەوەریت

دوای وەفاتی ئازیز و ترپەی دڵمان رسول اللَّه ﷺ و هاوەڵان و تابعین، تێپەربوونی هەزار و چوارسەد ساڵ زیاتر، بەرە بەرە خەڵکی دوور کەوتنەوە لە ئیسلام و کوفر فیکر و ئایدۆلۆژیای خەڵکی کۆنترۆڵ کرد، تەواو کەوتووینەتە نێو گێژاوی دونیا و غەرقی دەریای فیتنە و ئاژاوەکان بووین . سەرەڕای دوورکەوتنەوەی خەڵکی لە ئیسلام ڕۆژ نیە باس و هەواڵێکی کوشتن و خۆسوتاندن و کچ و کوڕ نەکرێ کەس نازانێ لەسەر چی دەکوژرێن، نەمانی شەرم و حەیا و گۆرینەوەی ژنی یەکتر بۆ پارە و چێژبینین و نێربازی و دەیان و سەدان و خراپە و تاوانی تر. بۆیە ئازیزمان ئاگاداری کردووینەتەوە لەسەردەمی فیتنە و زۆری ئاژاوەکان کە کەسی دانیشتوو لە ڕاوەستاو چاکترە لەکاتی فیتنەدا.

هاوەڵی ئازیز پێشەوا ابو بکر (اللَّه لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەری ئازیز ﷺ فەرموویەتی: بێگومان لەمەولا چەندین فیتنە بەرپا دەبێت بزانن ئاگاداربن دیسان پێتان دەڵێم لەمەولا چەندین فیتنە بەرپا دەبێت، دیسان ئاگادار بن لەمەولا چەندین فیتنە بەرپا دەبێت، ئەوەی دانیشتووە تێیدا باشترە لەوەی بەناویدا دەڕوات، ئەوەیشی تێیدا دەڕوات باشترە لەوەی بە تەکان بەرەو پیریەوە دەچێت، ئاگاداربن کاتێکیش دابەزییە ناوتان-یا

ڕوویدا- با هەرکەسێك حوشتری هەبوو بچێتە بەلای حوشترەکەی خۆیەوە و هەرکەسیش مەڕی هەبوو بابچێت بەلای مەڕی خۆیەوە، هەرکەسیش زەوی و زاری هەبوو بابچێت بەلای زەوی و زاری خۆیەوە.

**عَنْ أَبِي بَكْرَةَ (رضي الله عنه) قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: (إِنَّهَا سَتَكُونُ فِتَنٌ، أَلَا ثُمَّ تَكُونُ فِتَنٌ، أَلَا ثُمَّ تَكُونُ فِتَنٌ الْقَاعِدُ فِيهَا خَيْرٌ مِنَ الْمَاشِي فِيهَا، وَالْمَاشِي فِيهَا خَيْرٌ مِنَ السَّاعِي إِلَيْهَا، أَلَا فَإِذَا نَزَلَتْ -أَوْ: وَقَعَتْ- فَمَنْ كَانَ لَهُ إِبِلٌ فَلْيَلْحَقْ بِإِبِلِهِ، وَمَنْ كَانَتْ لَهُ غَنَمٌ فَلْيَلْحَقْ بِغَنَمِهِ، وَمَنْ كَانَتْ لَهُ أَرْضٌ فَلْيَلْحَقْ بِأَرْضِهِ)**[١].

بۆیە سەردەمەکە کەس بەکەس نیە و هەموو بەدوای تێرکردنی نەفس و شەهوەتیانەوەن، باشترین شت دوورکەوتنەوەیە و تێکەڵ نەبوونە، کوفر بەهەموو شێوەیەک دەستی گرتووە بەسەر جیهانی ئیسلامی و بێ ڕەوشتی و بێ ئەخلاقی بڵاوکردەوە و نەوەیەکی هێناوەتە ژیان تەنها بیریان لای سک و دامێنیانە، نە شەرم و حەیا ماوە، نە ئەخلاق، بۆیە باشترین شت بۆ ئیماندار خەمی پەروەردەکردنی خۆی منداڵ و ژنەکەی بێت، هەر بەتەنها بتوانی کچ و ژنت پەروەردە بکەی ئەوە لەم سەردەمە سەرکەوتوبوی و تۆ بەختەوەری.

---

[١] - صحيح مسلم الرقم: ٢٨٨٧.

چونکە لە ئێستا کەس ئامۆژگاری وەرناگرێ، نە برا، نە خوشک، کەس گوێدارت نابێ، کەسی وا هەیە پێیان گوتوە خوشکت لەگەڵ کوڕ دەستی تێکەڵ کردوە، گوتویەتی چبکەم باوکمان هەیە با ئەو ئامۆژگاری بکات، لە کاتێکا براکەشی لەگەڵ کچان ڕادەبوێری و گوتیان لەگەڵ شەش کچ پەیوەندی هەیە، بۆیە هەموو کەوتونەتە دوای ڕابواردنی نەفسیان.

بۆیە بۆ ئەوەی دووربی لە فیتنە هاوسەرگیری کردن باشترین کارە لەگەڵ کەسی موتتەقی و ئەهلی ئیمان و تەوحید تاکو جەوێکی ئیمانی پێکەوە دروست بکەن، گەر تۆ پیاوەکەت، یان ژنەکەت ئەهڵی تەوحیدە و دوورە لە ئەهلی دونیا ئەوە بەردەوام شوکربە و سجدەی شوکرانە ببە، بزانە کە سەروەتی دونیا هەموو هی تۆیە دەبێ دڵخۆشترین کەس بیت، بۆیە خۆت بکە قوربانی بەردەوام لە خزمەتی بە و نرخ و قەدری بزانە تاکو لە دەستت نەداوە.

چونکە باسمان کرد چ سەردەمێکی پڕی فیتنەیە، سەڵەفی ساڵح ئامۆژگاری یەکتریان کردوە و یەکتریان ئاگادار کردۆتەوە لە زۆری فیتنەکان.

یحیى بن أَبي كثير ئەڵێ: چومە لای أَبِي سلمه بن عبدالرحمن کە نەخۆش کەوتبوو پێی گوتم: ئەگەر ئەتوانیت بمریت بمرە، سوێند بە اللَّه ڕۆژێک دێت بەسەر خەڵکیدا مردن خۆشەویست ترە لە لای هەریەکەیان وەک لە بەدەست هێنانی ئاڵتونی سوور[١].

ئێستاکەش خەڵک ئەوەندە بێزارە لە ژیان و ئاوات بە مردوو ئەخوازێ، لەبەر ناخۆشی و نەبوونی و زۆری کێشەکان، بۆیە ئێمە کاتێ ئەڵێین با کچان شوو بکەن و ژیانیان نەفەوتێنن لە پێناو بڕوانامەیەکی بێسوودی دونیایی کە ١٦ ساڵ بخوێنی و نەبیتە هیچ بۆیە کچ دەبێ ژیرانە بژیت چۆن ژیانی بەڕێ دەکات، چۆن کچ وەکو کوڕ نیە هەمووشت بکات و گەر تەمەنی بڕوات کەس داوای ناکات، و بە بێ پیاوی دەمێنێتەوە بۆیە ئێمە بۆ سەلامەتی و خۆشی کچانمانە تا ژیانێکی خۆشیان هەبێ لە ژێر سایەی گەنجی ديندار و بەڕەوشت، خوێندن و بڕوانامەی بێسوود نابنە دڵخۆشی تۆ وە ئەوانەی دەچنە زانکۆ و پەیمانگا گەر زۆۆر تەقوادار نەبێ و ئیمانێکی پۆلاینی نەبێ دین و دونیای دەدۆڕێنێ.

سوێند بە اللَّه ساڵی یەکەمی دەوامم کچێک لە بەشەکەمان بوو زۆر مولتەزیم بوو یەک تاڵ قژی دیارنەبوو ئەوەندە بەجوانی خۆی دائەپۆشی،

---

[١] - بڕوانە: العُزْلَة لِلْخَطَّابي , ص٧٨

له داخلی بوو لەگەڵ هاوڕێکانی سبحان اللّٰه ڕۆژبه ڕۆژ بەرەو سفوری ئەچوو ڕۆژێ هاته دەوام تەواو سفور ببوو، کچەکانی گرووپ لێی کۆببونەوە و پیرۆزبایان لێی دەکرد و وەسفیان دەکرد که جوان بووی.

بۆیه کچ عاتیف و ساویلکەیه پێویستی به پەروەدەیەکی قیامەتی هەیه و دڵی عەمەلیات بکرێ و بەشی دونیا و ڕابواردنەکانی دەربێنی و دڵێکی پاک و بەهێز و قیامەتی له جێگای دابنرێتەوە، ئینجا بڕوات بخوێنێ له بەشێکی شەرعی و حەرام نەبێ وەکو فەلسەفه و یاسا و ئەدەبی وڵاتان، ئێستاکه دایک و باوکان کچیان دەبنه قوتابخانەیەک وانەی مۆسیقا و ڕەقس و قونباندانیان فێر دەکەن، له منداڵیەوە بێ ڕەوشتیان فێر دەکەن و بەیانی گەورە بوو له زانکۆ دەبێته قوربانی تێرکردنی شەهوەتی گورگەکان.

کاتێ کۆلێژ و پەیمانگا تەواو دەکەن دەگەنه تەمەنێك که کوڕان دەگەنه ئەو تەمەنه هیچ داهاتێکیان نیه تا بتوانن خێزان پێکبهێنن نه دامەزراندن هەیه و نەکارێ تا بتوانن دەست مایەك بێته دەستیان و تا هەوڵی هاوسەرگیری بدەن، کچەکانیش وورده وورده تـەمەنیان هەڵدەکشێ، لەگەڵ ئەو تەمەن هەڵکشانەش بەهۆی کاریگەری قسەی خەڵك و دەورووبەر لەناخەوە تووشی گرێی دەروونی دەبن، تووشی پاڵەپەستۆی قسه پوچەکانی کۆمەڵگا دەبن، دڵەڕاوکێ و بیرکردنەوەی زۆر ناخیان دەخوا، وایان لێدێ هەست به

کەم و کوڕی و نامۆیی دەکەن لەناو ئەو کۆمەڵگایەی کە پڕیەتی لە کەم و کوڕی و بێ ڕەوشتی، بۆیە هانا دەبەنە خۆشەویستی پێش زەواج.
زۆرێك لە کچان هەوڵ دەدەن پێش ئەوەی تەمەنیان هەڵکشێ و نەگەنە ئەو حاڵەتە دەروونیەی کەباسمان کرد زووتر بەدوای کوڕدا دەگەڕێن و پەیوەندی خۆشەویستیان لەگەڵ دەبەستن تا لەم ڕێگەوە بتوانن زووتر هاوسەرگیری ئەنجام بدەن، کە ئەم جۆرە پەیوەندیەش بەداخەوە ڕووداوی خراپی لێدەکەوێتەوە و کۆتایی چیرۆکەکان بەخراپتر لەوە کۆتایی دێ کەکچان بیری لێدەکەنەوە.
ئەمە نامەی کچێکە دەڵێـت: دڵم بەوە خۆش بوو قۆناغی ئامادەییم تەواو کردووەو چوومەتە کۆلێژ، ساڵی یەکەمم ئاسایی بەڕێ کرد و نمرەکانم باش بوون ساڵی دووەم یەکترناسینەکان زۆر دەبوون و تێکەڵاوی و دانیشتن و قسە و لێك نزیکبوونەوەکان زیاتردەبوون، لەم نزیك بوونەوانەش کوڕێکم ناسی زۆر ڕێك و پێك، دوای ئەوە ماوەیەکی باش پەیوەندیمان هەبوو وەك و خوشك و برا بەڵام دوای ئەو ماوەیە پەیوەندیەکە گۆڕا و هۆگری بووم و خۆشەویستی کەوتە نێوانمان.
بەبەردەوام قسە و نامە گۆڕینەوە لە نێوانمان هەبوو، قسەو نامەی زۆر زۆربەی جارەکان ڕایدەکێشاین بۆ قسەکردنی سێکسی بێ ئەوەی من مەبەستم بێ ئەو جۆرە قسانە بکەم

کاتێ دەکەوتینە ناو ئەوقسە سێکسیانە ئەوکوڕە دەیگوت کەی بێم وابکەین؟ کە بەتەنها بین ئاوا و ئاوات لێدەکەم، من ئەو قسانەم بەشتی ئاسایی لێکدەدایەوە، تا ڕۆژێك زوو لە کۆلێژ هاتینە دەرەوە گوتی وەرە بچین خانوەکەمانت پیشان بدەم پێشتر باسی کردبوو کە خانووی بۆ خۆمان کڕیوە تا دوای تەواو بوونی کۆلێژ بێتە داوام و لەو خانوە بەیەکەوە بژین منیش بەڵێنم پێی دابوو لە مەجالێکا بچین ببینیـن، ئیتر ئەو ڕۆژە چووین لەڕێگادا زۆر ئاسایی مامەڵەی دەکرد هیچ چاوەڕوانیەکی خراپم لێی نەبوو تا ئەو کاتەی گەیشتمە ماڵەکەم، ئەو ماڵەی کە بڕیارە ببێتە شوێنی حەوانەوەو پشوودانم، ببێتە ئەو بەهەشتەی کە ئەو کوڕە دروستی کردبوو لە ناخ و بیرکردنەوەکانم ئەو ماڵەی کە دەبێتە شوێنی لەدایك بوونی منداڵەکانم، بەڵام کەوتمە داوەکە.

ئەو ماڵە دۆزەخ بوو شوێنی لەگۆڕنانی من بوو، منداڵی چی !!!

پشوودانی چی !!!

ئەوەی نەدەبوو بهێڵم بکرێ کرا، بە ئازارێکی زۆرەوە جلەکانم لەبەر کرد و قاچم هێزی تێدانەبوو توانای هەڵگرتنی منی نەبوو، تا گەیشتمەوە ماڵ نازانم ئەو کوڕە چی دەگوت.

گەڕامەوە ماڵ نەمتوانی وەکو ڕۆژانی ڕابردوو دەستی دایکم ماچ بکەم و سەیری بکەم، نەمتوانی کەمــێ لەلای دابنیشم و ماندووبوونم

بحەسێنمەوە، جگە لەوە نامەیەکم بۆهات لە ماسنجەرەکەم سەیرم کرد ئەوکوڕە بـــوو.

ئەو زانی من زۆر تێکچوویمە بەو کارە هەندێ قسەی کرد تا هیچ نەڵێم دواتر هەڕەشەی کرد گەر هەرچیەك بڵێم ڤیدیۆکەم بڵاو دەکاتەوە، بەڵێ ئەو بێشەرەفە ڤیدیۆی گرتبوو، بۆی ناردم ئەوەی کەباش بوو بۆمن دەم و چاوم دەرنەچوو بوو ئەگینا ئەوەی تر عەورەتی خۆی و منی دەرچواندبوو من پشتم لەکامێراکەبوو لەبەر ئازاری زۆری دواوەم ئاگادار نەبووم ئەو ڤیدیۆ دەکا.

لەو کاتەوە لەمن دوورکەوتەوە پەیوەندیم پچڕاند، ئێستا نە دڵم بە بڕوانامەکەم خۆشە نە دامەزراندنیش، لەماڵێ کەوتووم زۆر بێهیوام تەمەنم هەڵکشاوە، داواکارم زۆر هات بەڵام نەمتوانی شوو بکەم لەبەر دووهۆکار:

یەکەم: کاتێ پیاوێ دەهاتە داوام وامدەزانی ئەویش وەکو ئەو بێ شەرەفەیـــە و یاری بەناموسی خەڵك کردووە بۆیە دڵم سارد دەبوو.

دووەم: کاتێ پیاوێ دەهاتە داوام دەمگووت ئەوە پیاوێکی باشە من شایستەی ئەو پیاوە پاکە نیم من نابێ ببمە دایکی منداڵەکانی، ئەو پاکە با بەهۆی منەوە شەرمەزار نەبێ گەر ڕۆژێ ئەو تاوانەی منی زانی پێ دەشکێ.

بەڵێ ئەو بەسەرهاتە ڕاستەقینەیە و دەیان و سەدان نموونە هەن، کچ گەر زۆر بە ڕەوشتیش بێ کوڕێک خۆی لێی نزیک بکاتەوە بە درۆ خۆی وانیشان بدات کەسی چاکە و بە ئەدەبە یەکسەر باوەڕی پێدەکات و هۆگری دەبێت و دواتر کوڕە بە دڵی خۆی وەکو گورگی برسی لەسەر جەستەی یـــــاری دەکات.

پاشان ئەوانەی ئەچنە داخلی و دوور ئەبن لە ماڵ و کەسوکــاریان، زیاتر شەیتان لەوان نزیک ئەبێتەوە، ئەو دوورکەوتنەوەیە لەماڵ و دوور لە خێزان ئازادیەکی زۆر بۆ کوڕ و کچان دروست دەکات، ئەمەش زۆربەی جارەکان کارەساتی ناخۆش و جەرگبڕی لێدەکەوێتەوە لەلایەن هەردوو ڕەگەز کەلەکۆتاییدا ئەوکارەساتانە دەبێتـــــە هۆی تێکدانی دەروون و چارەڕەشی ژیان فەوتاندنیان هۆکاری ئەو کارەساتانەش دەگەڕێتەوە بۆ پەروەردە.

مامۆستایەکی بەڕێز بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ڕۆژێکیان تەلەفۆنێکم بۆ هات کچێك بوو، کە دەستی بە قسەکردن کرد هەستت بە ترس دەکرد لە قسەکانی دا، منیش ڕێگام دا و گوێم بۆ قسەکانی گرت و گوتی:

مامۆستا ئێمە چەند کچێك بووین لە یەکێك لە بەشەناوخۆییەکانی ئەم هەرێمە، یەکێك لە خوشکەکانمان لەگەڵ کوڕێك دەستی بە قسەکردن کرد، ئێمە هەموومان ئامۆژگاریان دەکرد کە دەست لەو کوڕە هەڵگرێ بەڵام

سوودی نەبوو و بەردەوام لەڕێگەی مۆبایل و دواتریش چوونە دەرەوە لەگەڵ ئەو کوڕە بەردەوام بوو، کوڕەکە بەوە خۆی خستبووە ناو دڵ و مێشکی ئەو کچە کە دەچێتە داوای و دەیکاتە خێزانی داهاتووی، کوڕەکە وێنەی کچەکەی کەوتە لای و کچەکەش بەهەمان شێوە، خۆشەویستیەکە زۆر زۆر بوو لەلایەن کچەکەوە بۆ کوڕەکە و بەردەوام ئەو کچە باسی ئەو کوڕەی بۆ دەکردین، ئێمەش هەردەم ئامۆژگاریمان دەکرد بەڵام هەر سوودی نەبوو، تا ئەوەی لێی دەترساین ڕوویدا .

ڕۆژێکیان بە تەلەفۆن قسەم لەگەڵی کرد حاڵی پەشۆکاو بوو، پێم گوت: چیتە باش دیارنیت، ئەویش بۆی گێڕامەوە و گوتی: ئەو کوڕەی کە خۆشم دەویست.

گوتم: ئێ!! گوێم لێتە بڵێ!، گوتی: ڕۆژێکیان وەکو ڕۆژانی تر لەگەڵ یەکدا چووینە دەرەوە، بەڵام ئەوجارەیان جیاواز بوو، لە ڕۆژەکانی تر، منیش گوتم: جیاوازییەکە چ بوو؟، گوتی: ئەو کوڕەی کە خۆشمدەویست داوای ئەوەی لێمکرد، تا لەگەڵی جووت بم، گوتم: ئێ! ئەتو چیت کرد؟، ئەویش گوتی: من ڕازی نەبووم و خۆم نەدا بەدەستەوە، ئەو کوڕە زۆر هەوڵیدا بەڵام من هەر ڕازی نەبووم هەرچەندە ئەو بەڵێنی هاتنە داخوازی پێ دام تا ڕازیم بکا بەڵام من هەر خۆم نەدا بە دەستەوە .

لەگەڵ خۆشەویستەکەم یەکترمان جێهێشت، دواتر خۆشەویستەکەم تەلەفۆنی بۆ کردم هەڕەشەی وازهێنان و بڵاوکردنەوەی وێنەکانی لێکردم، منیش خەریك بوو شێت بم، ئەو کەسەی کە خۆشم دەویست ئێستا چیم پێدەڵێ!، بۆیە هەستم کرد ووردە ووردە ئەقڵم لەدەست دەدەم، بۆیە بڕیارمدا خۆم بکوژم ئەوەبوو خۆم دەرمان خوارد کرد و ئێستا دکتۆرەکان کەمتر لە هەفتەیەکیان بۆ داناوم، زۆر پەشیمانم بەڵام تازە کات بەسەرچوو ...

کچەکە دەڵێ مامۆستاگیان ئێستا ئەو کچە لەژیان نەماوە و جێی هێشتین، بەڵام براکانی گومانیان لە مردنی خوشکەکەیان هەیە و بەردەوام پرسیاری ئەوە دەکەن کە خوشکەکەیان هیچ کێشەیەکی هەبووە؟، ئێمەش ناوێرین و ناتوانین ڕاستیەکە بڵێین، لەبەرئەوەی کوڕەکەش هەڕەشەی ئەوە دەکات کە ئەگەر ئەو شتە ئاشکرا بکەن هەمووتان دەکوژم، ئێستا ئێمە تێدا ماوین نازانین چی بکەین و ڕوو لەکوێ بکەین .

لێرە قسەی ئەو کچە تەواو بوو، بەڵام کێشەکان بەردەوامن و چەندینی تر وا لەڕوودانن، بەڵام دەپرسم خوشکەکانم ئەگەر پیاوێك بە حەرامی تۆی بوێ بە حەڵاڵی چۆن تۆی دەوێ......!؟

برایەك گوتی من زۆر کچ دەناسم بەهۆی دووری لەکەس و کاریان و دووری لە دین و نەبوونی بیروباوەڕێکی پاك و نەترسان لە پەروەردگار

دەستیان بەکاری داوێن پیسی کردووە جا بەشێکیان هەر بۆ حەزی خۆیان و بەشێکی تر بۆ پارە پەیداکردن، جا ئەوانەی بۆ پارە داوێن پیسی دەکەن لەگەڵ هەموو کوڕێك دەردەچن، تا لەو ڕێگەیەوە بتوانن خەرجی زانکۆ دابین بکەن لەگەڵ خواردن و پێداویستی ڕۆژانەی خۆیان.[١]

ئەمانە بەشێکە لە ڕووداو گەلێکی حەقیقی و ڕاست کە کچان بوونەتە قوربانی و ژیانیان فەوتاوە لە زانکۆ و بەشە ناوخۆیەکان، ئێمە لە پێناواللَّه دەستەکانمان ماندوو دەکەین، پەنجەکانمان ووردو خاش بوون، ئەوەندەی بنووسین سوێن بە اللَّه لە خەمی ئێوەمانە چۆن ئێمە موسڵمانین و بۆ یەکتر ئەبینە یەک جەستە بۆیە زانکۆ و خوێندن و چوونە دەر فیتنەیە بۆ ئافرەت، لە زانکۆ و پەیمانگا گەر زۆر دیندار و بە ڕەوشتیش بی بزانن کچی جوانی داوای پەیوەندی و زەواجت لێ ئەکەن گەر ڕازی نەبی ساقیتت ئەکەن.

ئەمە نموونەی خوشکێکی ترە کە عەبابو و زۆریش مولەتیزم بوو دەڵێ:

من کچێکی داپۆشراو بووم تا کۆتایی زانکۆش چاوم بەرچاوی مامۆستایەک یان کورێک نەکەوت لە دوای تەخەروج مامۆستایەکی خۆم داوای زەواجی لێکردم بەڵام ڕازی نەبووم چونکە هاوسەری هەبوو، دوای ٢ ساڵ ویستم ماستەر بخوێنم ئیتر ئەو هاتەوە زانکۆم و بوە مامۆستا، هەر تورەبوو بەوەی کە من ڕەفزم کردبوو ئیتر زۆر ئیزعاجی دەکردم بەڵام من

---

[١] - تێبینی: سوودم وەرگرتووە وەکو سەرچاوە لە کتێبی ژیانی دووم لە نووسینی برامان ساڵار عومەر .

بەردەوام بووم و زیرەک بووم لە وانەکە لە تاقیکردنەوەی کۆرس لە ڕۆژی تاقیکردنەوەی ئەو نامەم بۆ هات نوسرابوو کە تۆ کەوتوی دوایی ئەنجام هاتەوە بینیم بەڕاستی منی کەوتاندوە لەدەرسەکەی زانیم لە خولی دوەمیش دیسان من دەکەوێنـێت زۆر هەوڵم دا لە زانکۆ گوتیان ناتوانی دەفتەری ئیمتیحان وەرگریەوە هەوڵدەوە بۆ خولی دووەم ئیتر من هیچ چارەم نەما و دوای ماندوو بون و مەسرەفێکی زۆر وازم لە خوێندن هێنا چونکە لەگەڵ دکتۆرەکانی زانکۆ هیچ ناکرێت چ بڵێی باوەرت پێناکەن و قسەت بۆ هەڵدەبەستن هەر قسەی دکتۆرەکان لەپێشتر دادەنـێن ئیتر لە زانکۆ چەند توندبیت و پەیرەو بەدین داری بیت و بەڕەوشت بی کە دکتۆرێك مامۆستایەک شتێکی لێ داواکردی هیچت لەگەڵی پێناکرێت یان دەبی ڕازی ببی یان دەبێت واز لەخوێندن بهێنی ئیتر وەك جەهەنەمە باش و خراپ بچێتە ناوی هەر بەشی خۆی دەسوتێت.

ئەمە کورتەی قسان بوو، ئینجا سەردەمی حوکمی ئیسلام نیە کچ بڕواتە دەرێ و کەس نەوێرێ سەیری بکات، و تەعدای ناموسی لێبکا چۆن ئیسلام لووتی دەست درێژی کەران دەبڕێ، بەس ئێستا حوکی ئیسلام نیە بە ئازادی بگەڕێیت و داوای مافت لە قازی بکەیت.

پێشەوا سفیان سەوری (رحمه اللَّـه) دەفەرموێـت: بـۆ ئـافرەت هـیچ شـتێ باشتر نیە وەک ماڵەکەی خۆی کە تێیـدا بمێنێـتەوە نەچێـتە دەر گەر چـی پیریش بێت.[١]

بۆیە ئێستا لە نەبوونی حوکمی اللَّە یاری بە ژیانی ئافرەت دەکرێت، بۆیە دانیشتن و خۆپاراستن لەفیتنەکان باشترین کارە بۆ سەلامەتی دونیا و دوارۆژت



[١]- بڕوانە: الإستذكار ٢/٤٦٩

## نامەی خوشکێکی خوێندکاری زانکۆ

دوای بڵاوکردنەوەی بابەتی خوێندن باشترە یان شووکردن بۆ کچان، سپاس بۆ اللَّه خوێنەرێکی باشی هەبوو، ئینجا خوشکێکی بەڕێز باسی ژیانی زانکۆ و بەشە داخلی کچانی کرد کەچی ئەگوزەرێ لەو پرۆسەیە، گوتی:

من جگە لە ماڵی خۆمان و چەن خزمێکی نزیک تێکەڵاویم لەگەڵ هیچ کەسێکی وانەبوو بەس ئامانجم ئەوە بوو لە پۆلی شەش دەرەجەیەک بەدەست بهێنم و بەشێک تەواو بکەم.

بیرمە یەکەم ڕۆژ کە چوم بۆ زانکۆ بۆ پڕ کردنەوەی فۆرمەکان جلێکی داپۆشراو لەگەڵ لەچێکێکی توند ڕۆژانە لەچکەکەم بەرە بەرە لە توندی نەئەما جاری وابوو پانتۆڵ جاری وا بوو قژم دەرەکرد، ئەو کچانەی کە هاوڕێم بوون لە زانکۆ چۆن بە شێوازی جوان و باو میکیاجیان ئەکرد خۆیان ئەگۆری بێ گوێدانە ئەوەی جلەکە کورتە، تەسکە منیش کردم بەڵام هێشتا بەشێکی شەرمی خوای گەورەم هێشتبووەو بە تەمەنم دەستم بەر دەستی هیچ کەسێکی حەرام نەکەوتوە لە سەفرەی زانکۆ هاوڕێکانم بە شەش و حەوت کچەوە لە ریزی شان هەڵتەکاندن و تێر کردنی نەفسیان چەن جار پێیان وتووم بە زۆر منیان بردوە بۆ هەڵپەرکێ بەڵام لە بەر خوا رووم نەهاتوە دەستیان بگرەم، نەم کردوو ئەوە شتێکە تا ئێستاش سوپاسی خوای گەورە ئەکەم لە ناو کورەکان وا بڵاوبوە کە من تاکە کچم لە ١٠٥

خوێندکار کە هەڵپەرکێ و هەندێ رفتاری دوور لە ئافرەت ناکەم لە کۆتایی مەرحەلە یەک قەدەری خــوای گەورە وابــوو کە دەســت بــکەم بە خوێندنەوەی کتێب لە کتێبی ئاینی چوم بۆ کتێبی تر پێم ناخۆش بوو کە من وا دوورم لە خـوا چەن جـار ئـازاری وێـژدانم ئـازاری دڵـم نەی هێشـتوە ئاسوودە بم بەوەی جلەکانم بە حەزی نەفسم ئەکرد.
لەگەڵ هاوڕێیەکم پەیوەنـدیەکی زۆر باشـمان هەبـوو وای لـێ هـات بیـر و باوەرمان دەر بارەی دین ئاڵوو گۆڕ بکەیـن، چـونکە هەر دوکـمان خـوێنەر بـووین، ئەو کە لە تەمبەڵـی کە نـوێژ و رۆژوو نەئەکـرد لە بەر تێرکردنـی نەفسی چەن شـتێکی ئەکـرد وای خسـتبوە مێشـکمان کە دۆزەخ نـیە، هەر تەنیا بەهەشتەو بەس بەهەشتی جۆراو جـۆر منـیش کە ئەو کتێبـانەی ئەم خوێنـدەوە ئەم گـوت خـوا بەو گەورەی خـۆیە دۆزەخـی نیـیە تـا سـاڵێ زیاتریش ئەو فکرەمان هەبوو خەڵک ئەچێ بۆ زانکـۆ غەڵەت ئەکـات مـن پێشی بێ ئیمان بووم کاتێک کە چومە زانکۆ و چومە داخلـی وەک پێشـتر نامێنیتەوە چی لە ڕوی جل و بەرگ چی لە ڕووی دینەوە.
ئاخر ئەوە ئاسانە لەگەڵ چوار پێنج کچی تر تـێکەڵ ئەبیـت شـەو رۆژتـان پێکەوەیە من سەرەتا لەچکـم قەپـات بـوو جـل و بەرگـم بـاش بـوو، بەڵام بەهۆی کاریگەری کچەکانی دەووروبەرم زیـاتر گرنگـی دان بە میکیـاج و جلی مۆدێل و نمیچە ڕووت و خۆ جوانکردن بـۆ زانکـۆ مەژغـوڵ بـووین،

هەر کچەو پەروەردەی ماڵێکە من بە نیو سەعات لە ماڵ هـیچ کـات دوور نەبووم کچ هەبووە لە بەشە ناوخۆی بە مانـگ نەچـۆتەوە دایـک و بـاوکی پێی نەوتوە بیرتەکەم وەرەوە بۆ ماڵ.

یەکەم ساڵی زانکۆ بەفر باری گوتیان ئەچین بۆ شەڕە بەفر منیش کچەکانی ژورەکەم هەموو یان ئەچوون منـیش ناچـار بـووم هەر کە چـوین مـن وام ئەزانی کە چەن وێنەیەک ئەگرن و تەواو ئاخر من هیچ کاتێک شەرە بەفرم نەکردوو بە کچ و کوڕەوە بە بیانووی شەرە بەفر باوەش و لە ئامیز بەیەکـدا کردن و یەکتر گرتن راکردن بە دوا یەک زۆرم پێـی سـەیر بـوو شـۆک بـوم سەیریانم ئەکرد تۆپەڵێ بەفربەرەو ڕوم هات هی کورێکی بەشـەکەمان بـوو کە من سڵاویشم لێ نەکردوە پێم گوت ئەخیر جارە شتی وا بکـەی، گـوتی هاتنە ناو بەفر یانی شەرە بەفر چی خۆشتر لەگەڵ گروپی خۆتا بێیـت کۆتـا جار بینیم ئەو کورە سێ کچـی بە گیـر هێنـابوو کە شـەرە بەفریـان ئەکـرد، یەکێک لە کچی بەشەکەمان گوتی کورەکانی خۆمان جوان نین ئەوە چیـیە سەیری ئەو بەشە بکە کورەکانیان چەن جوانە مـن ئەچـم بـۆ ئەوێ شـەرە بەفرەکەم چوو لەگەڵ کورێکیان شەرە بەفری کرد تاوای لـێ هـات نـاوی زانی و فەیسبوکی یەکتریان کەوتە لا ساڵێک قسەو نەفس تێرکردن و وێـنە ناردن، کچەکە گوتی وازمهێنا ئالودەی خۆمم کرد و داوای خۆشەویستی و زەواجی کرد من رازی نەبووم !

ئینجا من و هاوڕێیەکم ئەوەمان خستە دڵمان کەخوای گەورە بەهەشتی هەیە بەس دۆزەخی نییە، ئەم بۆچوونە ڕێگایەکی باش بوو بۆ ئێمەی نەفام کە جل بە دڵی خۆمان زۆر جار چەندین هەڵەی وەک باس کردنی خەڵکی غەیبەت کردن بکەین و بە گوناحی دانەنێین کەس لە ئێمە لە ناو ئێمەدا شارەزای ئاینی ئیسلام نەبوو تا ئەوانی تریشی پێ ئاگادار بکاتەوە، ئەبوایە هەر کچەو هاوڕێی کوڕی هەبێت کە بەشانازی و بە پۆزەوە باسیان ئەکرد کە ئەوە لە ئیسلام رێگە پێ نەدراوە، هیچ هاوڕێیەتیەکیش تا سەر نییە هێشتاوامان ئەزانی داخلی و زانکۆ خۆشترین شوێنن کە خەونمان بوو لە هەندێک شتەوە بۆم ڕون بوە کە ئەمانەشی تێدایە ئەکرێ.
ئەم نموونە لە بیناکەمان کچێکی تێدا بوو زۆر بە ڕەوشت و بە ئەدەب بوو بە هۆی کێشەی ژوور ئەو مەرحەلە یەک بوو کەوتە ژورێک کە بەس یەک دوو کچی مەرحەلە چواری تێدا بوو، کە بە خراپ باس ئەکران دوای ماوەیەک کچەکە بە ئەخلاقە رفتار گۆڕا بێشەرم بوو خوێندکاران خۆیان لێ دوورەخستەوە لەناو کۆمەڵە خوێندکاران باسی شتی بێ شەرمی ئەکرد دوای چەن مانگێک گوتیان دەستی تێکەڵکردوە لەگەڵ ئەو کچەی ژووریان کە هەموو داخلی و چاودێر ئەیان ناسی چ بێ رەوشتێک و لەش فرۆشێکە کە یەک و دووی شەو ئەهاتنەوە بە سەیارەی مۆدیل بەرز ئەیان گەیاندن دوانزەی و یەکی شەو ئەیان گوت لە چایخانە بووین وای لێ

هات ئەخلاق و هەموو شتێکی ئەو کچە تێک چوو کە مامۆستاکانی بەشەکە هەندێ قسەیان پێ ئەگوتن بە هیچ کچێکی تریان نەگئەوت بۆ بێتاقەتی خۆیان و تێرکردنی نەفسیان بە سەعات قسەیان ئەکرد، لە کۆتایدا زانی چی کردوە چی غەڵەتێکی کرد هەموو کەس باسی ئەکرد جارێک بینیم گوتم هەموویان باست ئەکەن بۆ وات لە خۆت کرد بە چاوێکی سوک قسەت پێ ئەڵێن هیچ وەلامی نەبوو.

هەموو خۆشەویستیەکی زانکۆ و پەیوەندیەکە مەرج نییە تا سەر بێ کاتێک تۆ پاکی چی لە هاوڕێیەتی یان خۆشەویستی بکەی رەنگە کەسی بەرامبەر وانەبێ و فلێباز و بەدوای داوێن پیسی و ڕابواردن بێ، ئەوەم بۆ ڕون بووە نابێت متمانە بە هیچ کەسێک بکرێ کەسێک کە موسڵمان بێ رەنگە لە بەر خوای گەورە هەندێ شت نەکات بەڵام گەر کەسێ وانەبێت ئەتوانێ زۆر شت بەدڵی خۆی بکات بێ گوێدانە ئەوەی چیت لێ دێ کچیەتیت لەدەست ئەدەی یان لەڕوی دەروونیەوە یان چەن ئەڕوخێی.

هاوڕێیەکم زۆر بێدەنگ و بوو بە شەرم بوو بەژداری خولێکی کردوو لەوەوە کوڕێکی ناسی ئیتر خەریکی مۆدیلات و شتە دونیایەکان ئەبوو بووبە سفورێکی زۆر تەواو چەن جارێک ئەو لە داخلی بوو کوڕەکە لە ناو شار بوو دەرچون و پیاسەو گەڕانیان ئەکرد ئەی گوت منی خۆش ناوێ ئەگریا گوتی منی بۆ حەزو و تێرکردنی ئارەزووی خۆی ئەوێت داوای

چەندین شتی لێ کردووم گوتمە نای کەم گوتیەتی منت خۆش ناوێ ئەو هاوڕێمە نوێژوو رۆژووی ئەگرت غەمباری و بێتاقەتی زۆری بۆ هێنا وازی لە هەموو ئەرکە ئاینیەکان هێنا کە ئاشق بوەو کورەکە بە چاوێکی تر سەیری ئەکات بەسووکی دائەنێ ئەمە وای کرد دوای ساڵ و نیوێک توشی نەخۆشی دەرونی قورس بوو دیسانەوە دەستی کرد بە نوێژ دوعای ئەکرد بەس خوای گەورە ئەو کورە لە چارەی بنوسێ ببێتە هاوسەری ژیانی نەبوو وازی هێنا بێ ئومێد بوو هەتا ئێستاش کەسێکی ئاسایی نیە و تێکچووە تا ئێستاش دڵ خۆش نیيە بەختەوەر نییە و تووشی نەفسی بووە.

نموونەیەکم بینی کە ئێستا لەوە تێگەشتم کە من لە چی هەڵەیەکی گەورەدام، قەدەری خوای گەورە وابوو کە لە یەکێک لە قۆناغەکانی خوێندن بکەوینە خولی دووەم چەن کچێ بوین یەکمان ئەناسی لە یەک بینا بوین هەر کەسێکمان و لە ژورێکی جیادا وامان دانا هەموو مان شەوێک بچینە ژووری کچێکی ترمان بە سوتفە چوینە ژوری، گوتی من لە ژورێکم بەس یەک کچی تێدایە ئەویش سەعی ناکات هەر خەریکی تەلەفونە لە ژووری ئێمە کۆ ئەبینەوە، شەو چوینە ژور کچێکی قەڵەو دەم و چاوێکی زۆر جوانی هەبوو، لە شوێنی خەوتنەکەی دانیشت و تەلەفونی ئەکرد یەک پاکەت شیرینی گەورە لە بەردەمیدا بوو قسەکردن و پێکەنین و هەندێ شت وای دەرخست بۆم کە لەگەڵ کوڕایە، ئەو کچەی هاوڕێمان گوتی من

ئەمرۆ هـاتووم بـۆ ئەم ژورە هەر عەلاگە شـتەو ئەی هێنێـتە ژور جارێـک خـواردنە جارێـک شـیرینییە هەر جـارەو شـتێکە گـوتی پرسـیارم کـردوە، گوتیەتی ناسیاوێکمانە بۆم ئەهێنێ، گوتی درۆ ئەکات لەگەڵ کوڕ زۆر تێکەڵ ئەبێ لە ڵای کچی تر گـوتیەتی بەیـانیش موبـایلم بـۆ دێـت هـاتە لامـان و قسەی کرد کچێک بوو کە هیچ شـتێکی لا گرنـگ نەبـوو بەس خۆشـی و نەفس تێر کردن نەبێ بەس خەتی کردەوە سێ نامەی کورمـان بینـی گـوتی من ئەوە چەن ساڵە ئەکەوم بەس بۆ ئەوەی بکەوێتە داخلی و بە ئارەزووی خـۆی بجـوڵێ و هەڵسـو کەوت بکـات بەیـانیەکەی کـچەکەی ژوورەکەی گوتی دوو قات شـتی بـۆ هـاتوە بە پێکەنـین و خـۆ بـادان موبایلیشـی بـە دەستەوە بوو، دوای من یەکەم جارم بـوو کە شـتی وا ببیـنم هەمـوو گیـانم ئەلەرزی شەو تا بەیانی نەخەوتووم بیرم ئەکردەوە.

چەن ساڵێک چوم بۆ لای کچێکی هاوڕێم لەوێـوە تـێکەڵ بە ژورێکـی تـر بـوون ئەم بینـی وەک پێشـتر لە شـوێنێک دانیشـتبوو خەریکـی چـات و تەلەفـون بـوو کچێکـی مەرحەلە یەک گـوتی ئەوە چەن مـانگە هـاتوم دوو قسەی نەکردوە هەر خەریکی تەلەفونە بە پێکەنینەوە گوتی شتی باشیشـی بۆ دێ.

شەوێک زۆر سارد بوو لەگەڵ دووسێ هاوڕێم هەندێ خواردنمان پێ بـوو ئەبوایە بمان خواردایە لە شوێنێک چونکە لەدوو ژوری جیادا بوین ئێمەش

ئەبوایە بچوینایە یەکێک لە هۆڵەکانی سەعی کردن، چەن هۆڵێک گەراین نزیکی چوار پێنجێک یان گڵۆپەکان ئیشی نەئەکرد یان داخرا بوو یان کچ سەعی ئەکرد، بەس هۆڵێک مابوو چوین هەندێک مێز درا بوون بەیەک گەر کەسێک لەودیوی مێزەکانەوە بوایە کەس نەی ئەبینی ژورەکە گەرم بوو دیاربوو کە کچی لێیە هاوڕێکانم گوتیان با دانیشین من هەر گومانم لای ئەوە بوو کە چۆن گەرمەو کەسیش دیار نییە، دوو کچ لەو دیوی مێزەکان کە دیار بوو کاری بێ ئەخلاقیان ئەکرد کچ و کچ پێکەوە خۆیان تێر ئەکرد، کە گوێیان لە دەنگی ئێمە بوو چاویان بە ئێمە کەوت رەنگیان گۆڕا هیچ قسەیان نەکرد ئێمەش ئەویان جێ هێڵا هەموو ئەمانە ئەوە بوون من بیرم لێ ئەکردەوە باشە خراپەکان بێ شەرمەکان دوای مردنیان شوێنیان کوێیە؟

لە ناو ١٥ کچا پۆزوو لە خۆی بای بوون بەوە لێ ئەدرا کە قسە لەگەڵ چەن کوڕی گروپ بکەی چەندیان تۆی خۆش بوێت، کچەکان کۆ ئەبونەوە بۆ سەیرکردنی کوڕ کچ بووە لە ناو ئێمەدا یەکەم جاری بوو کە فێر بکرێت دواتر گەشتە ئەوەی کە پێش هەموو ئەو باسی ئەکرد.

کچ هەبوە سێ چوار باخی کوڕ و مامۆستای کردوە، کچ بوە بە جلی نیمچە روت لە ناو هۆڵەکانی داخلی بە کامێرا کردنەوەو قسە کردن لەگەڵ کوڕدا شەوەکەی ئەبردە سەر لە ناو محازەرە کچێکمان سنگی زۆر دەرە خست من

جارێــک بــۆم داپۆشــی گــوتی وامەکە بــا مامۆســتاکان دەرمچێــنن کە مامۆستایەکمان هاتە ژور گوتی کچم تـا مەعیـدەت دیـارە دای پۆشـە، ئەوە تێگەشتم ئەوە بۆ خەڵکیشی نەبێت جلێکی کورت و تەسک لە بەر بکات لە بەرچاوی خەڵکـی بە چـاوێکی سـوک سـەیر ئەکـرێ هەر شـتێ بە چیـدا ئەزانیت ئافرەتێک پاک نییە بێ ڕەوشتە خۆی نـایەت بڵـی مـن پـاک نـیم جلەکـانی هەڵسـوو کەوتەکـانی قسـەکانی دەری ئەخـات، هەتـا جلێکـی داپۆشراوت لە بەرا بێت ڕێزت زیاتر لە ئەگیرێ.

ئەمە ڕووداوێک و دوان و سەد نییە پرسیار لە هەر کەسێک بکەی ئەزانێت داخلی چییە لە هەر خێزانێک و نمونەیەکی ئەوماڵەی تێدایە.

کە ئــافرەت لاوازە بە قســە بە روکەش بە شــتی بــێ مانــاو لاوەکــی هەڵەخەڵەتێنرێ نەفسی پێ تێر ئەکرێ، ناپلیۆن کاتێـک وڵاتێکـی عەرەبـی داگیر کـرد بە هێـزی چەک نە بـوو بە هێـزی وشـکانی نەبـوو کە دەسـتی بەسەرا گرت بەڵکوو ئافرەت بوو.

گەر بێینە سەر باسی خودی زانکۆ و مامۆستاکان

مامۆستایەکمان خـۆی زۆر بە باشـەو بە شەخسـیەت بە ئەدەب دەرەخسـت ئینسان کە خۆی هاواری شتێکی بۆ خۆی کـرد بـزانە لەوەی کەمە نیەتـی، قوتـابی مەرحەلە چوارەکـان ئەیـان گـوت کە ئەم مامۆسـتا چەنـدین جـار نامەی ناردوە بۆ کچێکی پۆلەکەمـان ئەویـش جـوابی داوەتەوەو چەنـدین

جار قسەو گاڵتەو قسەی خۆشیان کردوە کچەکەش هاوڕێی کوڕی بوە شەرم لە نێوان کچەکەو مامۆستاکە نەما گوتی داوای وێنەی رووتی کردوە لەو کچە کورەکانیی هاوڕێی گوتیان وێنەیەکت بۆ ئەنێرین بۆی بنێرە چوو بوون لە سایت و ماڵپەری بێ رەوشتیە وێنەیەکیان دەست کەوت، بە کچەیان نارد بۆ مامۆستا بە وێنەو بەو چاتە هەرەشەیان لە مامۆستاکە کردوە کە گەر دەریان نەچێنێ و ئەسیلەیان نەداتێ پێش ئینتیحان، ئەوە ئاشکرای ئەکەن و شەرەف وناموسی مامۆستا بە ئاو دا ئەدەن، بۆیە ئەو ساڵە هەموو یان دەرچوون!

پێش مەرحەلە چوار لە هۆڵی ئینتیحان یەکێک لە مامۆستاکان چاودێر بوو چاوی پێم کەوت کە پێشتر وانەیەکی پێ گوتووم هاتە لام گوتی بۆ پێش مەرحەلە چوار بەحس ناکەی گوتم بیرم لێ کردۆتەوە یەکسەر گوتی وەرە لای خۆم یارمەتیت ئەدەم چەن کچێکی تریش گوتیان بەئێمەشی گوتوە، وا دیار بوو کە باش بێت بە شەخسیەت بێ، هەفتەیەک پێش ئەوەی بکەوینە لای کوڕێکی بەشەکەمان کە پەیوەندی بوو لەگەڵ کچێکی هاوڕێیان کچەکە گوتی ئەچینە لای ئەو مامۆستا بۆ بەحسی مەرحەلە چوار، گوتی شتی وانەکەن چەن کچی هەڵخەڵەتاندوە، بۆیە ئێمە لە ترسان نەچوین، چەن کچێکی تریشم پەشیمان کردەوە کە نەچن.

مامۆستاکان بە قسەی خۆش و بە گاڵتە بۆیان دەر ئەکەوت کامە کچ ئەبێتە نێچیری ئەوان، کام کچ وەک خۆیان بێ شەخسیەتە مامۆستامان هەبوە چاتیان بینیوە لەگەڵ کچان کە چی گوتوە چەن بێ ئەدەب بووە، بۆ بەحسەکەم پێویستم بە چەن سەرچاوەیەک بوو گوتیان بڕۆ بۆ لای فلانە مامۆستا کە چووم گوتی دوای یەکی شەو من مەجالی چاتم هەیە! دوای ئەو قسە بە سەلامیش بێ سەیرم نەکردوە.

مامۆستای زانکۆ بە گشتی زۆرێکیان بێ دینن ئەوەش شتێک بوو کە هەموو ساڵی چەن خوێندکارێکی کچی ساویلکەیان هەڵدەخەڵەتان باخ و مەزرعەیان هەبوو بوو بە ئاشکرا ئەیان گوت دەعواتی باخەکەمان بن هەندێ کچ هەبوو بۆ دەرچوون زۆر هاتوو چۆیان ئەکردن و لە کچیەتی ئەیان کردن بەژن.

ئەم باسە چیرۆک هەڵبەستراو نیە و دەیان و سەدان لەم نموزنانە خراپتر و بە ئازارتر هەن، کە کچان لە زانکۆ و بەشە داخلیەکان بوونەتە قوربانی ژیانیان بۆتە پارچەیەک لە ئاگر.

## هۆکار چییە کچان دەبنە قوربانی سەرەکی و ژیانیان دەفەوتێ بە ئازار..

پێم خۆشبوو باسی هۆکاری ئەوەش بکەین کە بۆچی کچان تووشی ئازار و ناسۆرە و خەم ئەبن، لە کۆتایی ئەبنە قوربانی دەستی ناپیاوەکان، چۆن پێمان ئەڵێن ئێوە هەمووشت ئەیکەنە خەتای کچ، بەس بابزانین هۆکار چیە؟!

سەرەتا خوی کچ وایە اللَّه تعالی وای دروستکردوونە بە نازو مەکراوی و ناسک بن، حەزیان لە گرنگی پێدان و خۆشەویستی و ڕێزە، حەزیان بەوەیە دیاری و شتی ڕازاوەیان بۆ بکڕی، ئینجا گەر پیاوەکەی جوانترین و قۆزترین و دەوڵەمەندترین گەنج بێ بەڵام گرنگی پێنەدات و خۆشەویستی بۆ دەرنەبڕی و ئیهمال بێ لە گرنگی پێدان، ئەوکات ئەو ژنە دڵی ئاسوودەو ئارام نابێ، ژیان و خۆشی و دەوڵەمەندی لای شتێکی بێ بەها و بێ نرخ دەبێ، لەنەبوونی گرنگی پێدان و خۆشەویستی پیاوەکەی هەست بە یەتیمی و بێکەسی ئەکات، بۆیە زۆرجا ئافرەت تووڕە و زیز بووە بە قسەیەکی خۆش و گیان و خۆ بەقوربانیکردنێکی پیاوەکەی ئاشت دەبێتەوە، یان بەکڕینی دیاریەکی بچوک و گرنگی دانێک تەواو گۆڕانکاری بەسەر دێ، ئینجا سەیری زۆری کێشەکانی ئێستا بکەین، بزانین بۆچی هەر ڕۆژەو هەواڵێکی سەیر دەبیستین، فلان کچ کوڕێک وای لێکرد، فلان لەسەر بڵاوکردنەوەی ڤیدۆکانی کوژرا، فلان ژن چوار منداڵی هەیە و دەستی

لەگەڵ فڵان کوڕ و پیاو تێکەڵ کردووە، فڵان پیاو شەوانە لەگەڵ فلان ژن ڕادەبوێرێت، ئەمانە و دەیان باسو خوازی تری قوربانیانی کچ و ژنان ئایە هۆکار چیە تەنها کچ و ژن دەبنە قوربانی، وەکو ڕای خۆم پێم وایە هۆکاری سەرەکی تەنها پیاوە، ئینجا باوک و دایک و براکەی کچەکەن، کە دەبنە دەردەسەری و ناخۆشی و ژان.

هۆکاریش کە دەڵێین برا و باوک چۆن لە بەر خۆشی و ئارەزووی نەفسیان هیچ ئاگایان لە ژن و کچ و خوشکی خۆیان نیە، نازانن کچ و خوشک و خێزانیان ئەوەندە تێنوی خۆشەویستین لەماڵی خۆیان کە لە دەرەوە یەکێ گوتی پێیان گیان وادەزانێت خەنی کراوە لەخۆشیان باڵدەگرێت و تینواتی دەشکێت، ئەوەندە بەتاڵن بۆ ئەوەی پڕ بن لە سۆز هەموو شت قبوڵ دەکەن، چونکە ئافرەت بونەوەرێکە سیفات و خوی وایە کە لە پێناو بەدەست هێنانی خۆشەویستی هەموو شت قبوڵ دەکات.

ئینجا کچەی غەریب براکەی خەریکی گەڕان و پیاسە و چوونە دەرە تا نیوە شەو، دوای هاتنەوەی خەریکی موبایل و یاری بۆبچی و چاتی کچان دەبێ، باوکەکەش لەبەر ئیش و کار ئاگای لە کچی نیە، خەم و کێشەی چیە، یان کچ و خوشکی خۆیان هەر لە منداڵیەوە پەروەردە بکەن و فێریان بکەن اللّٰە تعالی چاودێرە بەسەریانەوە و ئیمان و تەقوا بخەنە دڵی کچە، بۆ

ئەوەی هیچ گورگ و چەقەڵێ نەتوانن زیانی پێ بگەیەنن، و ئەو ئیمانە ببێتە پەرژین و قەڵغان لە بەردەم خۆیی و گورەگە سک برسیەکان.

بەداخەوە، کەوتووینەتە ڕۆژگارێک هەریەکەو خەمی خۆشی و ڕابواردنی نەفسی خۆیەتی، باوک لەبەر ژنەکەی خۆی ئاگای لە کچەکەی نیە، ها کچی شرینم چیت پێویستە، بۆت بیکرم چیت دەوێ حەزت بەچیە، دایکەکە بە هەمان شێوە خەریکی خۆ خۆشەویستکردنە لای پیاوەکەی، لە ناخ و ئازار و ئاواتی کچەکە تێناگات، یان باوک و دایکی بەردەوام شەڕو هەڵایانە پێک ناهێن بۆیە بێئاگان لە کچی داماویان، پاشان براکەی وەکو گوتمان خەریکی چونە دەرە و پیاسەیە لەگەڵ هاوڕێکانی، یان هەوڵی پەیداکردنی ژن دەدا و بەدوای کچ کەوتووە، بۆیە کچە لە ماڵ غەریب بووە، و هەست بە بێکەسی خۆی دەکات، کاتێ کە ئەچێتە زانکۆ، بازار، دەوامەکەی، یان بڕواتە خەت کوڕێک نامەی بۆ دەنێرێ بە دوو قسەی خۆش مەست و بێ هۆش دەبێت، وا ئەزانێت فریشتەی لە ئاسمان بۆ دابەزیوە، ئەوکات گیرۆدەی دەستی دەبێ، و عاشقی دەبێ، کەسی عاشقیش شێتە ئامادەی هەموو شت دەبێت لە پێناو مەعشوقەکەی ئەو کوڕەش بە ئارەزووی دڵی چڵکن و پیسی یاری بە هەست و جەستەی دەکات، و سەرنجام دەبێتە کێشەی شەرەف و قوربانی دەستی ئەم ناپیاوە،

کە کوڕە تێربوو ئەڕوات کچی تر هەڵبخەڵەتێنی و پاروی تری چەوری پەیدا بکات.

سیفاتی پیاوی خراپ و زاڵم وەکو گورگە حەسوود و چاو برسیە بە هیچ شێوە تێر نابێت چۆن گورگ هێرش دەکاتە سەر کۆمەڵە مەڕێک لە حەسودی و ڕق و کینە زۆربەی مەڕەکان ئەخنکێنی یەک دانە ئەخوات، بەهەمان شێوە پیاویش وایە ژن و ماڵی خۆی هەیە حەز دەکات لەگەڵ زۆربەی ئافرەت ڕابوێرێت و خۆشی ببینێت، ئینجا کوڕ و گەنجانی ئەم سەردەمە بێ ئیش و کار و دوورن لە دین، بۆیە بۆ پڕکردنەوەی فەراغ و خۆشیەکانیان دەست دەکەن بە ڕاوکردنی کچەکان.

خەتاباری سەرەکی هەموو پیاوە، بڕوا بکەن ئافرەت غەریب و گوناهن، و زۆرینەیان دوورن لە سۆز و گرنگی پێدان و خۆشەویستی، بۆیە وەکو پیاو نین، بەتایبەت گەر کچ بکەوێتە دەست ناپیاوێک، ژیانی دەبێتە پارچەیەک لە دۆزەخ و هەناوی دەسوتێنی و ئەی توێنێتەوە وەکو بەفری بەر هەتاو، قژە ڕەشەکەی ڕۆژ بە ڕۆژ تاڵە سپیەکان جێگای ئەگرنەوە، زوو پیر ئەبن ژیانیان ڕەش دەبێ و ڕەشتر لە هەموو ڕەشیەک، هەمیشە جلە جوان و ڕازاوەکەیان بەنیەتی جلی تازیە و خەم و ئازار ئەپۆشن.

خۆشی لای وان سەفەری یەکجارەکی کردوە و ناخۆشی و ژان تەواوی جومکەکانی ژیانی گرتۆتەوە ناخۆش و بە ئازار لە هەموو ئازارێک ئەژین.

زۆرێک لە کچ و دایکانیش بوونەتە قوربانی خراپی باوکیان.
خوشکێ باسی حاڵی خۆی بۆ ناسیاوێکمان کردبوو کە خۆی و دایکی چۆن تووشی باوکێکی زاڵم و دڵ ڕەق و نوێژنەکەر بوونە، باوکی تووشی تلیاک و ماددەی هۆشبەر بووە، گوتی کاتێک دەرمانی تەواو دەبێ شێت دەبێ لە هەمومان ئەدات، بەیانی لە بەر خەو لێی داوم لووتی پڕ خوێن کردوم ئێستا گێژم، دایکم ڕۆیشتووە بە دوای خزمەکان بەهاوارم بێن کە باوکم دەمکوژێ، ئەیگوت دەستی دایکمی بریندار کردووە، و لە ژیانمان خۆشیمان نەبینوە، بۆیە دەیگوت بەهیچ شێوەیەک باوەڕمان بە پیاو نیە، و پیاو هەموو خراپن، دڵیان ڕەش بووە لە پیاوان تف و نەفرەت دەکەن لە نێر، بەهۆی زاڵمی و خراپیان، هەست و سۆزیان بۆ زەواج نەماوە و ترس و دڵەڕاوکی زاڵبووە بەسەریان، بەهیچ شێوەیەک بیر لە شووکردن ناکەنەوە لەترسی خراپی پیاوان.
بۆیە داوامان لە باوک و برایانە چاویان لە خوشک و ژنی خۆیان بێ و ڕۆژانە، گرنگی و خۆشەویستی بێ سنوریان پێدەن و لێیان بپرسن چیان پێویستە بۆ ئەوەی بە هیچ شێوەیەک کەس نەتوانێ هەڵیان بخەڵەتێنێ، کە دووربوون لە سۆز و گرنگی پێدان و سەرەڕای ئەوەی پارەیان نەبوو ئامادەن هەموو شت بکەن لەگەڵ گورگی سک برسی و خنکێنەری خۆشییەکان.

بۆیە لە خراپی هەڵسوکەوتی باوک و برایان و نەبوونی سۆز و ڕەحم هانا بۆ کەسی تر دەبەن، وەکو گوتم کچ خوی وایە حەزی بە خۆشەویستی و گرنگی پێدانە و بۆ قسە و باشییەکی درۆینەی کوڕی گورگ ئاسا زوو هەڵدەخەڵەتێ، بۆیە سەرنجام دەبنە قوربانی.

کە بوونە قوربانی ئیتر ژیانیان دەفەوتێ و ناتوانن شوو بکەن و دوودڵی و دڵەڕاوکێ زاڵ دەبێ بەسەری، لە کۆتایی نەخۆشی نەفسی ڕووی تێدەگات.

ئینجا خوشکی من ئەی ئەو کەسەی دووری لە هەموو خۆشەویستی و گرنگی پێدانێک پێش هەموو شتێک بۆ خۆت ژیرانە بژی، هەوڵدە خۆت شارەزای ئیسلام بکە، گەر تۆ خۆت هەوڵنەدەی و بەتەمای خۆت نەبێ و خەم لە دونیا و دواڕۆژت نەخۆی دڵنیابە ژیانت دەفەوتێت بە ئازار و ناخۆشیەکانی ڕۆژگار بە تەمای باوک و براو دایکی ئیهماڵت بیت، ژیانت خۆشی بەخۆییەوە نابینێ چونکە هەر یەکێك لە باوك و دایك و برا و خوشکت هەموویان خەمی خۆیانە و کەس لەماڵەوە پێت نالێ کچم قورئان بخوێنە، ها ئەو ئامۆژگاریە بخوێنەوە، یان ها کچم ئەم کتێبەم بە دیاری بۆ کڕیوویت یان ئامۆژگاریت بکەن لەگەڵ ڕێزم بۆ هەندێ (باوک و براو دایکی بەهەڵوێست) کە ماندوو هیلاکن لە پەروەردەکردنی منداڵەکانیان، بەڵام مەبەستم ئەوانەن ئیهماڵن لە پەروەردەی ژن و کچیان، هەر خەریکی دونیا و خۆشی و هەڵاو بەزم و مۆدێلات، کۆکردنەوەی

پارەن، جا دەبێ تۆی کچی ژیر خۆت هەوڵدەی زەخیرە و کردەوەی چاکە بەڕێ بکەی بۆ دواڕۆژت و شارەزای ئیسلام بی، گەر هەموو کەس تۆیان ئیهماڵکرد ئیسلامەکەت شارەزابووی بەرنامەی الله گەشبینی و وزە و هیوات پێدەبەخشی و وات لێدەکات لەسەر پێیەکانت بوەستی منەتت بە هیچ کەس نەبێت و لە دواڕۆژ بەهەشت ببێتە شوێنت.

ئامۆژگاریم بۆ خوشکان و بۆ ئەو ئافرەتانەی هاوسەرگیریان کردوە، سەرەتا بۆ کچان ئەی کچی لاو ئەی ئەو کچەی ئاواتت ژیانێکی خۆش و بێ کێشەیە و ئاواتت ئەوەیە پیاوێکت هەبێ بە هەموو دونیات نەدات، ئەوە تەنها ئارام و سەبر بگرەو تەوەکول و یەقینت بە الله بێت و هەر داخوازیەکت هات زانیت گەنجەکە دینداری ڕاستەقینەیە ڕازیبە پێی، دوو دڵ مەبە دڵنیابە خۆشی دونیات لای ئەو گەنجە سالیحەیە کە ئاوات و ئامانجی لەگەڵت ژیانە لە پێناو اللّٰە تعالی بۆیە لەگەڵت خراپ نابێ و هانا بۆ کچی تر ناباو غەدرت لێناکات، بۆیە باشترین چارەسەر بۆتۆ لە دووربوونت لە ناخۆشی و ئازار و خەم و خراپی و ناز هەڵنەگرتنت لە ماڵەوە تەنها شووکردنتە بە کوڕی سالحیە.

ئاموژگاریان بۆ ئەو پیاو و ئافرەتانەی هاوسەرگیریان کردووە، ڕێز و قەدر و نرخی یەک بزانن و هەوڵدەن بۆیەک بژین و چاو و داوێنیانیان بپارێزن لە حەرام و شوکر و سپازگوزاری اللّٰە بن کە ئێوە چوونەتە ژیان و ماڵ و

منداڵ و خانوی خۆتان هەیە کەسانێک نیانە بـۆیە هانـا بـۆ کـاری خـراپە مەبەن و غەدر و ناپاکی مەکەن بەرامبەر یەکتر، هۆکـاری ناپـاکی زۆربەی خیانەتەکان بۆ پیاو ئەگەڕێنمەوە، چونکە پیاو بە دەسەڵاترە لە ئافرەت دەبێ زۆۆر خۆشەویستی بدات بە خێزانەکەی و نازی هەڵگرێت و ڕێـزی زۆر و خۆشەویستی بێ سنوری بۆ دەربڕێ بە کـردەوە و بەقسـەی خـۆش، هەر بۆیە کاتێک سەیری دوو هاوسەر بکەین کێشەیان هەبێ پیاوەکە ئەڵێـت بە باوک و براو کەسی ژنەکەی پارە ماڵ و نان و هەموو شتی هەیە لەچی کەم نیە و هەموو شتم بۆ تەرخانکردووە کچەکەتان هاربووە و بەهیچ ڕازی نـیە، ئەم پیاوە تێناگات کە هاوسەری لە نازو سۆزی هاوسەریەتی بێبەشە، بـۆیە ئافرەتەکە لەوانە شـەرم بکـات بڵێـت ئەم پیـاوەم ڕۆژێـک قسـەی خۆشـی لەگەڵ نەکردووم، نەیگوتوە شاژنەکەم قوربانت بم هەموو کەسـم یـانی ئەو ژنە یەتیم کراوە لە ڕووی گرنگی پێدان و خۆشەویستەوە، بۆیە نامورتـاحە، ئاسوودە نیە و دڵی بەو ژیانە خۆشنیە و بۆڵە بۆڵ دەکات، سەرنجام دەبێـتە کێشە.

پیـاوی بەڕێـز و ئاغـای جوامێریشـی کەوتـۆتە دوای داوای شـەیتان و تێرکردنی نەفسی بەڕابواردن لەگەڵ کچ و ژنان، وەکو گوتومان حەزی لێـیە لەگەڵ زۆرترین ژن ڕابوێرێت بۆیە زۆر پیاوم دیووە، لە کـۆڵان وەسـتاون و ژن و منداڵیان هەیە ئافرەتێک تێپەڕیوە بەیەکتریان گوتوە وای سەیرکە لەو

ژنە جوانە، مەبەستم یانی چۆن دەبێ پیاو وابێ دەبێ شەرم بکات و پێی غەدر بێ لەناو سەد ئافرەت دابێ لە پێناو اللّٰه پاشان ژنەکەی حساب بۆ هیچ ژنی دونیا نەکات، هەموو ژنانی دونیا بکاتە قوربانی خێزانەکەی خۆی، بۆیە کە پیاو وابو ئیمهال بوو لە خێزانەکەی ئەویش ناچار دەبێ هانا بۆکەسی تر ببات و فەراغی نەفسی پێ پڕ بکاتەوە، بە پیاوی دەڵێ سەبرمان ناهێ خەتمان بۆ بکڕە ئیتر کێشەکان لێرەوە قوڵتر دەبنەوە ڕێگای پەیوەندی بۆ ژنەکە ئاسانتر دەبێت، ماوەیەک لەمەو بەر کوڕێک نامەی بۆ ناردم براکەم من خوشکێکم هەیە و ٥ منداڵی هەیە ئێستا زانیومانە منداڵی بچوکی لە پیاوێکی ترە بە زینا و لە ڕێگای چاتەوە کابرای ناسیوە، ئایە جائیزە خوشکم بکوژین، گوتم چۆن زانیوتانە و ئاوا دڵنیان، گوتی هەموو شتمان بۆ ئاشکرا بووە و ئەو خوشکەمان بەسەرەدان گەڕابوویەوە ماڵمان بە موبایڵی خوشکی بچوکم هاتبوویە خەت لەبیری کردبوو لە فەیسبوکی خۆی بڕواتە دەر، دواتر چاتەکانمان هەموو بینیووە و بۆیە سەدا سەد دڵنیا بووینە کە منداڵەکە لە زینایە.

سەدا ٩٥ هەموو کێشەکان لە ئەستۆی پیاوە، سبحان الله پیاو چەند ئیهماڵ و خراپن گەر پیاو گرنگی بەخێزانی بدا چۆن غەدری لێدەکات، ئەو پیاوەی بە سۆز و ڕەحم و میهرەبان و گرنگی بە خێزانی ئەدات و ڕۆژانە لە خەم و ئازار و کێشەکانی دەپرسێ، ئەو ژنە چۆن دڵی دێ بڕوات بەدوای

پیاوی تری گورگ ئاسا بکەوێت، وە هیوادارین ئەو ئافرەتانەی پیاویان ئیهماڵە و لەگەڵیان خراپن، زۆر جار ئەبیستین تەنانەت ئافرەتی مێرد داریش لەگەڵ کوڕێک یان پیاوێک دەستی تێکەڵ ئەکات، ئیتر ئەگەر هۆکارەکەی خەم لێنەخواردنی هاوسەرەکەی بێت یان ساردی بێت یان خراپی هاوسەرەکەی ئەوە نابێتە هۆکار بۆ ئەوەی تۆی ئافرەتیش خیانەت بکەیت و بەچات و نامەی دڵداری لەگەڵ کوڕو پیاوی خەڵک دەست تێکەڵ بکەیت، ئەتوانی بەسەربەرزی داوای جیابونەوە بکەی نەک دوای پیاوەکەت بە سەرشۆڕی تەڵاقت بدات و لای کەسو کارت شەرمەزارت بکات کە داوێن پیسی و تۆ ببیتە قوربانی سەرەکی.

بۆیە هیوادارم تا ژیانتان خۆشەو بێ کێشەن شوکربن و گرنگی بەیەکتر بدەن.

## یەکێکی تر لە هۆکارەکانی بوونە قوربانی کچان....!

ئەو ڕاستیە ئەبێ بزانین کە زۆرینەی کچەکانمان کاتێک توشی هەڵەیەک ئەبن، یەکێک لە هۆکارەکان ئەوەیە تینوی تێرکردنی حەزە جنسیەکان نین، بەڵکو تێنوی ناز و ڕێز و خۆشەویستی و گرنگی پێدانن، هەر بۆیە کاتێک ئەبینین کە کوڕێک دەیەوێ کچێک گیرۆدەی خۆی بکات و هەلی بخەڵەتێنێت، سەرەتا داوای زینا و چوونە دەرەوەی لێ ناکات و ناڵێت وێنەی خۆتم بۆ بنێرە!

بەڵکو سەرەتا گرنگی پێ ئەدات و نازی پێ ئەدات و گشت چرکە و سعاتێک لێی دەپرسێت، کارت و وەحدەی بۆ دەکڕێ، وای لێدەکات پێوێستی بە هیچ کەس نەبێ دەمارەکانی تەنها پێویستی بە خوێنی ئەو بێ، هەناسەکانی وا لێدەکا کە پێویستی بە ئۆکسجین نەبێ بەڵکو ئەو ببێتە هەناسەی و تەنها گیردۆدەی ئەو بێت، و پێی ئەڵێ خۆشی ئەوێت تا وا لە کجەکە ئەکات ژیانی واتە بوونی ئەو کوڕە، نەبوونی واتە مردن و فەوتانی، ئینجا کچەی داماویش وا ئەزانێ مەلائیکەتی بۆ دابەزیووە بەتەواوی متمانەی پێ ئەکات، و خۆی تەسلیمی ئەکات بە نەفس و لاشەکەیەوە، ئینجا دواتر هێدی هێدی هێرشەکان دەست پێدەکەن لای گورگەکە و داوای وێنە و چوونە دەرەوە لە کچەکە ئەکات و توشی فاحیشە و داوێن

پیسی ئەکات و دواترش حەزە پیسەکانی خاڵی ئەکات لەسەر کچەی نەزان و پشتی لێدەکات و جێی دێلێ، یان دەیکاتە نێچیری خۆی هەرکات ویستی دەبێ ئامادە بێ لەگەڵی ڕابوێرێ و نەفسی پێی بەتاڵ بکاتەوە ئەگەرنا وێنەو ڤیدۆکانی بڵاودەکاتەوە و حەیا و حیشمەتی بە بای گەرمی هاوین دا ئەدات و ژیانی ئەسووتێنێ و ئەیکاتە دۆزەخ، ئەمەش ناخۆشی و ئازارەی کچان لەوەوە دروست ئەبێت کاتێک باوک یان برا یان هاوسەری ئەو ئافرەتە پشت گوێی ئەخەن و بێ ناز و بێ خۆشەویستی ئەکەن.
هۆکارێکی سەرەکی تریش دایکە، چونکە دایک بەردەوام لە ماڵە و ئەبێت هەر لە منداڵی و زۆر بچوکی ببێتە هاوڕێی کچەکەی دەبێ کچەکەی فێر بکات کە هەرچیەکی هەبوو تەنیا بۆ دایکی باس بکات، دەبێ ئەوەندە خۆشەویستی پێ بدات کچەکەی تێ بگات کە دایکی باشترین و نزیکترین هاوڕێیەتی لەژیان، چونکە کچ ڕووبەڕوی هەر شتێک بێتەوە بۆ نموونە کوڕێک پێی بڵێی خۆشی ئەوێ گەر دایکی هاوڕێی نەبێ و ترساندبێتی ناتوانێت بۆی باس بکات ئەترسێ دایکی بڕوای پێنەکات، بەداخەوە بۆ دایکانێک بەردەوام خەریکی تیکتۆک و سناپ چات و چاتی بێ ئیشن، کاتیان بۆ کچەکانیان و گرنگی پێدانیان نیە، ئەوکات لە نەبوونی کەسی نزیکی دایک و براو و باوکی کێشە و ڕووداوەکانی پەنا بۆ کچێکی هاوڕێی

دەبات و ئەویش نەزانـانە ڕێنمـوونی ئەکـات و ڕێـی پـێ نیشـان ئەدات و ژیانی ئەفەوتێنێت.

بەڵام ئەگەر دایکی هاوڕێی بێت و عاقڵ بێـت بەردەوام لێـی نزیـک بـێ و ڕێنمایی و ئامۆژگاری ڕاست و باشی بکات، وای لێ ئەکات هیچ حسابێک بۆ قسەی کوڕ دانەنێت.

ئەمە نموونەیەکە لە هاوڕێیەتی کچانی نەزان و جاهیل کە زۆر جـا بەهـۆی ڕێنمایەکانیـان ژیانیـان دەفەوتێـت، ئەمە ڕووداوی ڕاسـتەقینەیە کە چـۆن کچێک کەوتە دوای خۆشەویستی کوڕێکی جاهیل و دوور لە دین و دوای تێربوونی لەو کچە پشتی لێدەکات، کچە بەهۆی کاریگەری و هۆگربـوونی بە کـوڕەکە شـێت دەبـێ و ژیـانی دەفەوتـێ و ئینجـا لە ناچـاری پـرس بە هاوڕێکەی دەکات، تاکو ڕێـگە چـارەیەکی بـۆ بـدۆزێ و ئەویـش ڕێـگەی سحر و نوشتەی پێ نیشان ئەدات، با بزانین ڕووداوەکە چۆن بووە.

کچێك دەڵێ: مامۆستا من کەوتمە داوی خۆشەویستی لەگەڵ کوڕێك مـاوە یەکی زۆر بەیەکەوە بوین چەند داواکاریـەکم هـات لەبـەر ئـەو کـوڕە و لە پێناو ئەودا ڕەتمکردەوە و شوم نەکرد، چەند جارێـك داوام لـەو کـوڕە کـرد بێتە داوام بەڵام هەر جارە و بە بیانویەك خۆی ڕزگـار دەکـرد و بابەتەکـەی منی دەبردە لایەکی تر.

ڕۆژێکیان ئەو کوڕە تەلەفۆنی بۆ کردم و گوتی: ئەوە دواجارە تەلـەفۆنت بـۆ دەکەم نێوانی من و تۆ کۆتایی پێهات.
گوتی: من نامەوێ لەگەڵ کچێك هاوسەرگیری بکەم کە خیانەتی لە دایك و باوکی خۆی کردبێ ئەگەر کچێك خیانەتی لە کەس و کاری خـۆی بکـات بەیانی لەمنیشی دەکات.
گوتی: منیش زۆر پاڕامەوە کە وازم لێنەهێنێ بەڵام سوودی نەبوو.
هاوڕێیەکی کچم هەبوو کە ئاگاداری هەموو شـتێکی مـن بـوو هاتـە لام و گوتی: کەسێکی باشم دۆزیوەتەوە بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەی تۆ، منـیش بەپەرۆشەوە گوتم: کێ؟
گـوتی: بـڕۆ لای فلانـە شـێخ و بەسـەرهاتی خـۆتی بـۆ بگێـڕەوە بـەڵکـو چارەسەرێکت بۆ بدۆزێتەوە.
دەڵێ: منیش چوومە لای و باسەکەم بۆ گێڕایەوە، شێخ گوتی: ئەو کێشەیـە ی تۆ بەدوو ڕێگە چارەسەر دەکرێ، جارێ یەکەم ڕێگـە تـاقی دەکـەینـەوە ئەگەر ئـەو ڕێگـەیـە سـەری گـرت باشـە ئـەگینا ناچـارین ڕێگـەی دووەم بەکاربێنین. دەڵێ: ڕێگەی یەکەم بەکارهێنانی نوشتە و سیحربوو کـردی لـە بەرامبەردا بڕەپارەیەکی زۆری لێسـەندم ئـەویش هەنـدێ زێـڕم هـەبوو بـە نهێنی فرۆشتم و پارەکەم پێیدا کە یەك ملیۆن بوو.

سیحرەکە کاریگەری زۆری لەسەر ئەو کوڕە دروستکرد، ماوەیەك دەستمان بەقسەکردن کردەوە و تەلەفۆن لە نێوانمان بەردەوام بوو بەڵام ئەو کوڕە هەردەم دەیگوت دڵم توونده و بێزارم و هەندێ قسەی وای دەکرد

شەوێکیان تەلەفۆنی کرد گوتی: لە کەینێوە سحرت لێم کردووە؟

گوتی: منیش شڵەژام و گوتم: سیحری چی ؟

گوتی: ئەو ماوەیەی دڵم توووند بوو و بێزار و بێتاقەت بووم هەموو شوێنێکم کرد تا چارەسەریەك بدۆزمەوە تا لە کۆتاییدا تووشی مامۆستایەکی بەڕێزی ئاینی بووم و باسەکەم بۆی کردەوە و ئەویش ڕێگەی نیشاندام و دۆعای لەسەرم خوێند تا سیحرەکەی بەتاڵ کردەوە.

دەڵێ: ئەو کوڕە قسەی زۆری پێ گوتم و دواتر مۆبایلەکەی لەسەر داخستم و جارێکی تر بێئومێد بوومەوە، دەڵێ: کاتێك بە دڵێکی پڕ لە خەمەوە چوومە سەرجێگا بیری ئەو شێخەم کەوتەوە کە پێی گوتبوم ئەگەر ڕێگای یەکەم سەری نەگرت ئەو کاتە ڕێگای دووەم بەکاردێنین.

دەڵێ: بەیانی زوو خۆم گەیاندە شێخ و باسەکەم گێڕایەوە، شێخ گوتی: ئێستا یەك ڕێگات لەپێشە و ئەمجارەیان دڵنیابە ئەو کوڕە دەبێتە هی تۆ و دێتە داواشت. دەڵێ: منیش بەپەرۆشەوە گوتم: تەنها ئەو کارەم بۆ بکە هەرچی داوای دەکەی بیکە.

شێخ گوتی: ئەو کوڕە دڵی لەسەرت نەماوە و تۆی لەلا ناشرین بووە جا بۆ ئەوەی دڵی بکەوێتەوە سەرتۆ و تۆش لەبەر چاوی جوان بەدەربکەویەوە دەبێ هەندێ قسەی کرد منیش ڕازیبووم.

کە بەئاگا هاتمەوە هەموو گیانم دەلەرزی لاشەم ڕووت بوو، بەخێرایی خۆم کۆکردەوە و جلەکانم لەبەر کرد و ئەوێم جێهێشت، نەمدەتوانی بەباشی هەنگاوەکانم بهاوێژم لەبەر ئەو ئازارە زۆرەی کە هەمبوو بە هەرحاڵ و دەردەسەری خۆم گەیاندەوە ماڵ و ماوەیەك نەمدەتوانی دانیشم.

ئەو کچە گوتی: مامۆستا تکایە هاوارم بگەیەنە بە خەڵکی بەتایبەتی ئافرەتان ئامۆژگاریان بکەن کە بەهیچ شێوەیەك نەچنە لای ئەو ساحیر و داوێن پیسانە، مامۆستا ئەو شێخە داوێن پیسە بەقسەکانی بێئاگای کردم و لە دواوە لەگەڵم جووتبوو ئازارێکی زۆری دام پارەی لێسەندم پاکی لێسەندم و ئەو کوڕەشی بە یەکجاری لێ دوور خستمەوە، ئێستا ئەو کوڕە هاوسەرگیری کردووە منیش بە کۆمەڵێ سەرشۆڕیەوە چاوەڕوانی هاتنی کەسێکم بۆ ئەوەی شوی پێبکەم و تەمەنیشم هەڵکشاوە.

ئەمە قوربانی دەستی هاوڕێ نەزانەکە و گەنجە گورگ ئاساکەیە، کچ ساویلکەیە و دوای قسەی درۆینەی کوڕەکان دەبنەوە.

ئینجا هۆکارێکی تریش باوک و برا و هاوسەرە کە ئەڵێین پیاوان هۆکارن لەوەی کچ و ئافرەتان دەبنە قوربانی لەبەر چەند هۆکارێکە ئەویش پیاوان

خۆیان دوورن لە اللَّه و ئیسلام بـۆیە نـاتوانن ئەمـر بە چـاکە و ڕێگـری لە خراپە بکەن چونکە شتێک خۆت جێبەجێ نەکەی کەسـی بەرامـبەریش بە هیچ شێوەیەک گوێت بۆ ناگرێت،

هۆکارێکی تر پیاوان خۆیان لە ماڵەوە تەلەفزیۆن دەکەنە سەر کەناڵێـک کە فیلمێکی بێ شەرمی و بێ ئەخلاقی پێشکەش ئەکرێ و پڕە لەئافرەتی سفور و لەقتەی ناشرین و بی شەرم و ماچ ماچـانێ و لە کاتێکـدا خوشـکی یـان کــچ یــان هاوسەریشــی دانیشــتوە ئەمەش وا دەکــات ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خوشکی یان کچ یان هاوسەری شەرمی لـێ نەکەن و هەوڵـیش ئەدەن ئەو فیلمە تاقیبکەنەوە وەک ئەو فیلمەبن، یان کچەکانی خێزانەکەی بۆ سـەفرە و میــوانی و پێویســتیەک ئەچــنە دەر لەگەڵــی بە ســەیارەکەی ئینجــا تەجیلەکەی ڕادیۆکەی لەسەر گۆرانیەکی حەرام و پڕ لە ووشـەی نە شـیاو پێکردووە، ئەمەش وا دەکات ئیتر ئەو ئافرەتە برا یان باوک یان هاوسـەری بەکەم بێتە پێش چاو ئیتر شەرمی لێ ناکات.

یان هۆکاری تر بـرا یـان بـاوک لە پـێش چـاوی کـچ و خوشـک و کـچە خزمەکــانی لەگەڵ ژنــی مــاچی یەکــتر ئەکەن و یــاری ئەکەن، بـۆیە ئەو خوشک و کچانە شەرمیان دەشـکێ و هەولـدەدەن ئەوانـیش گـڕی دڵیـان دامرکێنن و بە هەر هۆکارێک بێت کەسێک بدۆزنەوە.

ئەم هۆکارانە وا دەکەن ئافرەت شەرم نەکات و قسە لەگەڵ کوڕان بکەن و ژیانیان بسووتێنن. هۆکاری تریش ئەو پیاوانەی لەسەر کار یان لەتۆڕە کۆمەڵایەتیەکان، بۆ خۆشی و کات بەسەربردنیان بەحەرامی قسە لەگەڵ کچی خەڵک دەکەن و نازیان پێ ئەدەن و گرنگی و خۆشەویستی دەر ئەبڕن بۆیان وای لێدێ ئافرەت و خێزانی خۆی ئیهمال ئەکەن، بۆیە ئافرەتەکە لە نەبوونی نازو گرنگی پێدانەوە هەوڵ ئەدەن وەک ئەو پەنا ببەن بۆ کوڕێکی تر تاکو نازیان پێ بدەن، و خۆشی خۆیان دامرکێنن.

سوێند بە اللَّه پیاو ئیماندار بێت و بەڕاستی اللَّه بپەرستێت نەک خوشک و کچ و هاوسەر دایک و تەواوی کچ و ئافرەتانی دراوسێ و جیرانەکانی شەرمی لێ ئەکەن.

بەڵام بەداخەوە پیاوەکان ئەوەندە سووک و بێ دەسەڵاتن تەنها بیریان لای خۆشی نەفسی خۆیانە، حەزە جنسی و شەهوەتیەکان زاڵە بەسەریان بۆیە بێئاگان لە کچ و خوشک و خێزانەکانیان کە پێویستیان بە گرنگی پێدان و خۆشەویستی هەیە.

ئەوە بەسەرهات و ڕووداوە ڕاستەقینانەی کە کچان ژیانیان فەوتاوە کچینیان لەسەر داناوە هێندە زۆرن کە فێڵیان لێکراوە و داوێنیان پیس کراوە کە بەژمار نایەن، بۆیە تکایە خوشکانم بۆ هەر کێشە و ڕووداوێک

دێتە پێش پرس بە براو دایک و باوکت بکە، بەداخەوە تەنها کچان دەبنە قوربانی و ژیانیان دەسووتێ بە ئازار و خەم.

بۆیە تکایە براو باوک و دایکان چاوتان لە کچ و خوشکانتان بێت ژیانیان با نەفەوتێت و گرنگیان پێ بدەن و لێیان نزیک بن و لە کێشە و خەمەکانیان بپرسن، ئەم قسانە هەموو ڕاست و حەقیقەتن بەڵام مانای ئەوە نیە کچ بڕوات هەموو کارێکی هەڵە بکات هەرچی حەزی لێ بوو بیکات مانای ئەوەنیە کچ ماف خۆیەتی خەریک خۆشەویستی حەرام بێت، نەخێر کچ کاتێ گەورە بوو ئەبێ بەدوای ڕێگەی ڕاست بڕوات و بزانێ اللَّە تعالی ئەمری بەچی کردووە لەسەری و مەبەستی ئێمە ئەوە نیە کچان موستەهەقن خۆشەویتسی بکەن و مافی خۆیانە لەنەبونی نازی باوک و براو هاوسەر پەنا بۆ خۆشەویستی حەرام ببەن نەخێر چونکە ئەبێ سەبر بگرن و لە اللَّە بترسن و خۆیان بپارێزن لەحەرام.

بۆیە کچ و خوشکانمان مافیان بەسەرمانەوە هەیە، تووشی کێشە و ناخۆشی بن هەر بۆ برا، باوک، دایک دەبنە ئازار و خەم، بۆیە ڕەحمەتان لێبێت چاوتان لێیان بێت. لەکۆتایی داواکارم لە اللَّە تعالی ئیسلاحی حاڵی هەمووممان بدات و خوشکانی موسڵمان دووربن لە هەموو ناخۆشی و ئازار و دەردو ژانێک و هاوسەری سالیحە بە قسمەتی هەمووممان بکات تاکو لە دونیا و دوارۆژ بەختەوەربین.

# ناوەڕۆك